بەشێك لە پەیامەکانی نوور

# شوکرانەبژێری

بەری ژیان و ئامانجی بەدیهاتنی بوونەوەرانە

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

تێبینی‌یەك:

ئـەم كتێبـەی بەردەسـتی خوێنـەری بەڕێز، لە چەند ناميلكە و وردە باسێكی "پەيامـەكانی نـوور" پێكـهاتووە، كـە سـەرجەميان لـە نـاوەڕۆك و ئامـانج و سوودەكانی شوكرانەبژێری و، زيانەكانی ناشكوری و هەڵپـە و ئيسـراف دەدوێـن. مامۆستا نوورسی بۆ خۆی لەو پەيامانە هـەڵی بـژاردوون و، بـەم شـێوەيە بـڵاوی كردوونەتەوە. (وەرگێڕ)

بەشی دووهەمی مەکتووبی بیست و نۆهەم:

## پەیامی ڕەمەزان

لە کۆتایی بەشی یەکەمدا پوختەیەك سەبارەت بە شەعائیرە ئیسلامی‌یەکانەوە نووسرا. لەبەر ئەوە، لەم بەشەی دووهەمدا چەند حیکمەتێك باس دەکرێن کە تایبەتن بە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزەوە، کە درەخشانترین و مەزنترینی شەعائیرەکانە.

(ئەم باسە بریتی‌یە لە "نۆ" سەرنج و مەسەلەی ورد و ناسك کە "نۆ" دانە لەو حیکمەتە زۆرانەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز دەردەخات)

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذي أُنزِلَ فيهِ القُرْآنُ هُدىً لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالفُرْقَانِ﴾ (البقرة:١٨٥)

◆ سەرنجی یەکەم

ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیسلام و، بە یەکێك لە گرنگترین پەرستشەکانی ئایینی ئیسلام دادەنرێت.

زۆربەی ئەو حیکمەتانەی کە بەروبوومی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانن، ڕوو دەکەنە: دەرخستنی پەروەردگارێتیی خوای گەورە و، ژیانی خۆیی و کۆمەڵایەتیی مرۆڤ و، پەروەردەکردن و پاکژکردنەوەی دەروون و، شوکرانەی بەخششە خواییەکان.

لێرەدا، لە نێوان ئەو حیکمەتە زۆرانەی کە لە ڕۆژوودا هەن و، پەروەردگاریێتیی خوای گەورەیان تێدا دەردەکەوێت، تەنها یەك حیکمەت باس دەکەین. ئەوەش بریتی‌یە لەوەی کە:

خوای گەورەی باڵادەست سەرزەویی کردووە بە سفرە و خوانێکی پڕ لە نیعمەتی لە ژمارەبەدەر، بە جۆرێکی وەهایش ئامادەی کردووە کە مرۆڤ پێی نازانێت و بیری بەلایدا ناچێت. خوای گەورە دەیەوێت بەم شێوەیە کەماڵی پەروەردگاریێتی و میهرەبانیی خۆی دەرببڕێت. کەچی ئەو حەقیقەتە جوانەی کە شێوەی سفرە و خوانەکە زمانی حاڵیەتی، مرۆڤ لە ژێر پەردەی بێ ئاگایی و هۆکارەکاندا نایبینێت و لەوانەیە لە بیریشی بچێتەوە.

بەڵام لە ڕەمەزانی پیرۆزدا ئیمانداران یەکسەر وەك سوپایەکی ڕێکوپێکیان لێ دێت و کاڵای بەندایەتی دەپۆشن و، پێش بەربانگ هەموو ئامادەی ئەنجامدانی ئەو فەرمانەی خوای گەورەی خاوەن توانای ئەزەلی دەبن، کە خوانکیان دەکات بۆ سەر ئەو سفرە و خوانە پڕ لە کەرەمەی خۆی و پێیان دەفەرموێ: "فەرموون"!

ئیتر ئیماندارانیش، بەم حاڵەیان، لە بەرامبەر ئەم بەزەیی و میهرەبانی‌یە گەورە و گشتی‌یەی خوای گەورەوە، بەندایەتیی فراوانی گەورە و ڕێکوپێك دەردەبڕن.

جا ئایا ئەو کەسانەی کە لەم پەرستشە بڵند و ڕێزلێنانە بەرزەدا بەشدارییان نەکردووە، شایانی ئەوەن ناوی مرۆڤیان لێ بنرێت؟

◆ **سەرنجی دووهەم**

چەندین حیکمەتی زۆر لە ڕۆژووی ڕەمەزانی پیرۆزدا هەن، کە مرۆڤ ئاراستەی شوکرانەبژێریی نیعمەتەکانی خواوەند دەکەن.

ئەمەش بەم نموونەیەی خوارەوە ڕوون دەکەینەوە:

بێ گومان ئەو خۆراکەی کە خزمەتکارێك لە خواردنگەی پادشاوە دەیهێنێت، نرخی خۆی هەیە (وەك لە وتەی یەکەمدا باس کراوە). کەواتە بە کەم ڕوانین و بێ نرخ زانینی ئەو خۆراکە بەنرخانە نیشانەی گێلی‌یە و، نەناسینی بەخشندەی ڕاستەقینەشیان لە بێ عەقلی‌یەوەیە، لە کاتێکدا کە خزمەتکارەکە پاداشت بدرێتەوە و خەڵات بکرێت!

هەر بەم جۆرە، ئەو نیعمەتە لەژمارەبەدەرانەی کە خوای گەورە لەسەر زەویدا بڵاوی کردوونەتەوە، بێگومان داوای نرخەکانیمان لێ دەکات، کە ئەویش بریتی‌یە لە شوکرانەبژێری ئەو نیعمەتانە. هۆکارە ڕواڵەتی‌یەکان لە ڕاستیدا بارکێشی ئەو نیعمەتانەن، هەروەها خاوەنە ڕواڵەتی‌یەکانیشیان وەك خزمەتکاروان بۆ پێشکەش کردنی ئەو نیعمەتانەی خواوەند. جا ئێمە وەك بەهای پێویست بەو خزمەتکارانە دەدەین، منەتبار و چاولەبەریشیان دەبین، بەڵکو زیاتر لە ئەندازەی خۆیان ڕێز و سوپاسگوزاری لە ڕوویاندا دەنوێنین.

بەڵام خۆ بەخشندەی ڕاستەقینەی ئەو نیعمەتانە، کە بەو جۆرە بەخشیونی و بڵاوی کردوونەتەوە، گەلێ شایانترە کە ئەوپەڕی سوپاسگوزاری و ستایشی بکەین و، لە ڕادەبەدەر ڕەزامەند و منەتباری ببین، کە هەر خۆی – بە زیادەوە – شایستەی هەموو ئەمانەیە.

جا پێشکەش کردنی سوپاس بۆ ئەو خواوەندە و، دەربڕینی ڕەزامەندی لە ئاستی ئەو نیعمەتەدا، بەوە دەبێ کە بزانین ڕاستەوخۆ لە لایەن خواوەند خۆیەوە هاتوون و، نرخیان بزانین و، هەست بەوە بکەین کە پێویستمان پێیانە.

کەواتە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز کلیلی شوکرانەبژێری ڕاستەقینە و خاوێنە و، شوکر و سوپاسێکی گەورە و گشتی‌یە بۆ خواوەند. چونکە زۆربەی خەڵك لە کاتەکانی تردا ئاوا بە ناچاری نرخی زۆربەی نیعمەتەکان نازانن، لەبەر ئەوەی بە ئازار و سوێی برسێتی گرفتار نابن. بۆ

نموونە: ئەوانەی کە زۆر تێرن، بە تایبەتی دەوڵەمەندان، ڕادە و پلەی ئەو نیعمەتە نازانن کە لە خواردنی لەتە نانێکی وشکدا هەیە، بەڵام باوەڕداری ڕۆژووانەتی لە دەمی بەربانگدا هەست دەکات کە ئەو لەتە نانە وشکە نیعمەتێکی بەنرخی خوایە و، بە هەستی "چەشتن" شایەتی لەسەر ئەمە دەدات.

کەواتە ئەوانەی لە ڕەمەزاندا بە ڕۆژوو دەبن، هەر لە پادشاوە تا دەگاتە بێنەواترین هەژار، بە بۆنەی هەست کردنیان بە نرخ و بایەخی ئەو نیعمەتە گەورانە، شوکرانەیەکی مەعنەویی مەزنیان دەستگیر دەبێت و، پێشکەشی خواوەندی خۆیانی دەکەن.

خۆڕاگرتنی مرۆڤ بە ڕۆژگاری مانگی ڕەمەزان لە خواردنی ئەو خۆراکانە، وا لەو مرۆڤە دەکات کە بە نیعمەتیان بزانێت و لە جێگای شیاوی خۆیاندا دایانبنێت. چونکە ئەو مرۆڤە لەگەڵ خۆیدا دەدوێت و بە خۆی دەڵێت:

(ئەم نیعمەتانە موڵکی من نین و من خاوەنیان نیم، چونکە لە خواردنیاندا سەربەست نیم. کەواتە موڵکی کەسێکی ترن، کە هەر لە سەرەتاوە نیعمەتی ئەو بوون و هەر ئەویش پێی بەخشیوم، وا ئێستاش چاوەڕوانی فەرمانی ئەو دەکەم بۆ خواردنیان)!

بەم جۆرە، شوکرانەبژێرییەکی مەعنەویی ئەو نیعمەتانە پێشکەشی خوای خۆی دەکات.

ئیتر بەم چەشنە، ڕۆژوو لە هەموو لایەکەوە دەبێت بە کلیلی دەرگای شوکرانەبژێری، کە ئەرکی ڕاستەقینەی سەرشانی مرۆڤە.

### ◆ سەرنجی سێهەم

یەکێك لەو حیکمەتە زۆرانەی ڕۆژوو کە ڕوو لە ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ دەکات ئەوەیە کە: ئەم خەڵکە لە باری گوزەرانەوە جیاجیا دروست کراون..

لەبەر ئەوە، خوای گەورە داوا لــە دەوڵەمــەندان دەکــات کــە دەســتی یارمــەتی بــۆ بــرا هــەژارەکانیان درێــژ بکــەن. گومــان لەوەشــدا نیــیە کــە دەوڵەمەندان بە تەواوی هەست بەو حاڵی هەژاریــیەی هــەژاران ناکــەن، کــە مایەی بزواندنی بەزەیی مرۆڤە و، ناتوانن پەی بە ڕادەی برسێتیی هەژاران بەن وەك ئــەوەی هــەژاران خۆیــان هەســتی پــێ دەکــەن، مەگــەر بــەهۆی ئــەو برسێتیــیەی کە لە ڕۆژوودا ئەوانیش تامی دەچێژن و بەخۆیانەوە دەیبینن!

جا ئەگەر ڕۆژوو نەبوایە، زۆر کەس لــەو دەوڵەمەندانــەی کــە شــوێنی ئارەزووەکانیــان دەکــەون، نــەیاندەتوانی ئــەندازەی ئــازاری ئــەو برســێتی و نەبوونیــیەی هەژاران و ڕادەی پێویستییان بۆ بەزەیی و میهرەبانی، تێبگەن.

لەبەر ئەوە، بەزەیی هاتنەوەی مرۆڤ بە هاوڕەگەزی خۆیدا (کە خواوەنــد ئەم بەزەییــەی لــە نــاخی مرۆڤدا جێگــیر کــردووە) دەبێــت بــە یــەکێك لــەو بنچینانەی کە هاندەری سوپاسگوزاریی ڕاستەقینەن. چونکە هەموو کەسێك (هەر کەسێك بێت) هەردەم دەتوانێت لــە خــۆی هــەژارتر بدۆزێتــەوە، کــە لــە لایــەن خــوای گــەورەوە لێپرســراوە بــۆ بــەزەیی پێــدا هاتنــەوە و دەســتگرۆیی کردنی..

جا ئەگەر "دەروون" بــۆ چەشتنی تــاڵاوی برســێتی ناچــار نەکرایــە، کــەس چاکەی لەگەڵ کەسی تردا نەدەکرد، کــە ئەمــەش بــەزەیی بــە یەکداهاتنــەوەی نێوان مرۆڤ داخوازیەتی. خۆ ئەگەر ئەم کارەشی ئەنجام بدایە، نەیدەتوانی بــە جۆرێکی کامڵ و شایستە ئەنجامی بدات، چونکە لە دڵ و دەروونی خۆیــدا بــە هەستێکی ڕاستەقینە هەست بەو بەزەییە ناکات.

◆ **سەرنجی چوارەم**

ســەبارەت بــە پــەروەردەکردنی دەروون(نــەفس)ی مرۆڤیــش، چــەند حیکمەتێك لە ڕۆژوودا هەیە.

یەکێك لەوانە ئەوەیە کە سروشتی "نەفس"ی مرۆڤ بە جۆرێکی وایە حەز دەکات لە هەموو خۆبەستنەوەیەك دەرباز بێت و، هەمیشە خۆی بە سەربەستی ببینێتەوە. بە ڕادەیەك کە داوای پەروەردگارێتی‌یەکی وەهمی بۆ خۆی دەکات، تاکو بە ئارەزووی خۆی بجوولێتەوە..

"نەفس" هەرگیز نایەوێت بیر بکاتەوە لەوەی کە بە نیعمەتە لەژمارە بەدەرەکانی خوای گەورە گەشە دەکات و پەروەردە دەکرێت. بە تایبەت ئەگەر لە دنیادا خاوەنی سەروەت و دەسەڵات بێت و، "بێ ئاگایی"ش پشتی گرتبێت. لەبەر ئەوە، وەك ئاژەڵ - بێ پرس - تەپ دەداتە سەر نیعمەتەکانی خوا و، دەکەوێتە هەڵلووشینیان.

بەڵام لە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا "نەفس"ی هەموو کەسێك، هەر لە زەنگینترین دەوڵەمەندەوە تا نەدارترین هەژار، دەکەوێتە ناسینی خۆی و، تێدەگات کە خاوەنی هیچ شتێك نی‌یە و، مۆڵەت نەدراوە بە ئارەزووی خۆی ڕەفتار بکات، بەڵکو موڵکێکە خاوەنی هەیە و، بەندەیەکی فەرمانبەردارە و، بە بێ ڕوخسەت و فەرمانی خاوەنەکەی ناتوانێت دەست لە بچووکترین کار وەربدات، تەنانەت دەست بۆ قومێك ئاویش ڕابکێشێت!

بەم جۆرە، لەخۆبایی بوون و پەروەردگارێتی‌یە وەهمی‌یەکەی "نەفس" دەشکێت و، کاڵای بەندایەتیی بۆ خوای گەورە دەپۆشێت و، ئەرکی سەرەکیی سەرشانی خۆی، کە شوکرانەبژێری‌یە، ڕادەپەڕێنێت.

◆ سەرنجی پێنجەم

سەبارەت بە ڕێککردنی ڕەفتارەکانی دەروونی یاخی و هاندەری خراپکاری (النفس الأمارە بالسوء) و، نەرمکردن و هاندانی بۆ وازهێنان لە هەڵسوکەوتە چەواشەکانی، ڕۆژووی ڕەمەزان حیکمەتی زۆری تێدایە.

لێرەدا تەنها یەك دانەیان باس دەکەین:

"دەروون"ی مرۆڤ - بە هۆی بێ ئاگاییەوە - خۆی لەبیر دەچێتەوە و، ئەو کۆڵەواری‌یە بێ سنوور و.. هەژاری‌یە لەڕادەبەدەر و، کەمتەرخەمی‌یە زۆرەی لە ماهییەتیدان، نە دەیانبینێت، نە حەزیش دەکات بیانبینێت!

لەبەر ئەوە، لە لاوازیی خۆی و، بەرەو نەمان چوونی و، ئەندازەی ئەو کارەساتانەی لە مەڵاسدان بۆی، بیر ناکاتەوە. ئەوەشی لە یاد دەچێت کە جەستەی لە گۆشت و ئێسکێکی ئەوتۆ پێکهاتووە کە بە خێرایی دەپرتوکێ و دادەڕزێت.. بۆیە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی بە جۆرێکە وەك پێی وابێت لە پۆڵا داڕێژراوە و مردن و فەوتانی بەسەردا نایەت! دەبینیت هەڵمەت بۆ دنیا دەبات و، بە کۆڵێ ڕژدی و تەماعکاری‌یەوە خۆی دەهاوێتە باوەشیەوە و، پەیوەندی‌یەکی بەتینی لەگەڵدا دەبەستێت و بە توندی چنگی لە هەموو شتێکی بەلەزەت و سوودبەخش گیر دەکات!

"دەروون" لەم ڕێیەوە ئەو بەدیهێنەرەی لەبیردەچێتەوە کە بەوپەڕی میهرەبانی پێی دەگەیەنێت و پەروەردەی دەکات. ئنجا لەمەوە بەرەو هەڵدێری بەدڕەفتاری دەخزێ و، دواڕۆژی ئەم دنیا و پاشەڕۆژی ئەودنیاشی لە یاد دەچێت.

بەڵام ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان وا لە بێ ئاگاترین و سەرسەخترین کەسی یاخی دەکات کە هەست بە لاوازی و کۆڵەواری و هەژاریی خۆیان بکەن. چونکە هەرکام لەوانە، بەهۆی برسێتی‌یەوە دەکەوێتە بیرکردنەوە لە خۆی و گەدەی بەتاڵی و، تێدەگات گەدەی پێویستی بە چی‌یە!

ئیتر خۆی بە باشی دەناسێت و ئەندازەی لاوازی و ڕادەی پێویستیی بۆ سۆز و میهرەبانیی خوای گەورە، بیر دەکەوێتەوە و.. لە ناخی دڵەوە - بە مەرجێ بێ ئاگایی چاوی دڵی لەکار نەخستبێت - هەست بە تاسە و ئارەزوومەندی‌یەکی ئەوتۆ دەکات کە بە هەژاری و لارەملی لە دەرگانەی

لێبوردن و میهرەبانیی خوای گەورە بدات و، دەست لە فیرعەونایەتیی نەفس هەڵبگرێت.

بەمەش ئامادەی ئەوە دەبێت کە بە دەستی سوپاسگوزاریی مەعنەوی لە دەرگانەی بەزەیی و میهرەبانیی خوا بدات.

◆ سەرنجی شەشەم

لە نێوان ئەو حیکمەتە زۆرانەی کە لە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا هەن، سەبارەت بەوەی کە قورئانی پیرۆزی تێدا هاتووەتە خوارەوە و، ڕەمەزان گرنگترین کاتی نازڵبوونیەتی، تەنها یەك حیکمەت باس دەکەین:

لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز لە مانگی ڕەمەزاندا نازڵ بووە، دەبێ واز لە داخوازییە نزمەکانی "دەروون" بهێنرێت و، کردارە بێ کەڵك و نابەجێکانی پشتگوێ بخرێن، تاکو خۆمان بۆ پێشوازی لێکردنی ئەو فەرمایشتە ئاسمانییە - کە قورئانی پیرۆزە - ئامادە بکەین..

ئەمەش بەوە دەبێت کە نازڵبوونی قورئان لەم مانگەدا بخەینەوە یادمان و، بە وازهێنان لە خواردن و خواردنەوە چەند حاڵەتێکی ڕۆحانی و مەلائیکەت ئاسا بۆ خۆمان بڕەخسێنین و، قورئانی پیرۆز بە جۆرێ بخوێنین کە وا هەست بکەین هەر ئێستا بە گەرموگوڕی و پاراوی ئایەتەکان نازڵ بووبن..

هەر بەم هەست و نەستە و بەوپەڕی ملکەچییەوە گوێی بۆ شل بکەین تاکو پلەیەکی ئیمانیی باڵا و حاڵەتێکی ڕۆحانی و بەرزمان دەستگیر ببێت، بە جۆرێك ئەوخوێنەرە وا بزانێت کە ڕاستەوخۆ لە زاری پێغەمبەرەوە ﷺ بەڵکو لە حەزرەتی جیبریلەوە - دروودی لەسەر بێت - بەڵکو لە خوای گەورەی ئەزەلییەوە، دەیبیستێت.. پاشان لە پێناوی ڕوونکردنەوەی یەکێك لە حیکمەتەکانی نازڵبوونی ئەم قورئانەدا، ئەرکی فێرکردن و خوێندنەوە و ڕاگەیاندنی بە کەسانی تر، ئەنجام بدەین.

بەڵێ، لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا جیهانی ئیسلام وەکو مزگەوتێکی لێ دێت.. بەڵام چ مزگەوت؟

مزگەوتێك کە هەموو گۆشە و سووچێکی بە ملیۆنەهای لەبەرکەرانی قورئان پڕ بووە و، ئەو فەرمایشتە ئاسمانی‌یە بە گوێی زەوی نشینیاندا دەدەن و، بە شێوەیەکی جوان و ڕوونیش ناوەرۆکی ئایەتی: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنـزِلَ فِيهِ الْقُرْآن﴾ لە پێش چاودا دەردەخەن. بەمەش دەیچەسپێنن کە لە ڕاستیدا مانگی ڕەمەزان مانگی قورئانە..

تاك تاکانی کەسانی تری ئەو کۆمەڵە مەزنەش هەندێکیان بەوپەڕی سام و شکۆ و ملکەچی‌یەوە گوێ لەمان ڕادەگرن و، هەندێکی تریشیان بۆ خۆیانی دەخوێنن!

جا ئیتر چی لەوە ناشیرینتر و شوورەیی ترە بۆ کەسێك کە خۆی لەم مزگەوتە پیرۆزە بە سام و شکۆیە دادەبڕێت و، بە پێی فەرمانی نەفسی یاخی و بەدڕەفتاری - لەم مانگەدا - بە شوێن خواردن و خواردنەوەدا لە هەڵپە و لسکەدایە؟ دەبێ ئەو کەسە تا چ ڕادەیەك مایەی بێزلێهاتنەوەی مەعنەویی کۆمەڵی ئەو مزگەوتە گەورەیە بێت؟!

حاڵی هەموو ئەو کەسانەی کە لە مانگی ڕەمەزاندا بە پێچەوانەی ڕۆژووگرانەوە ڕەفتار دەنوێنن، بەو چەشنەیە.. ئەوانە - بە هەمان پلە - مایەی ڕسوایی و بێزلێکردنەوەی مەعنەوین لە لایەن سەرانسەری جیهانی ئیسلامی‌یەوە!

◆ سەرنجی حەوتەم

مرۆڤ بۆ ئەوە هاتووەتە دنیا تاکو خەریکی کشتوکاڵ و بازرگانی‌یەك بێت کە لەودنیادا دروێنەی بەروبوومەکانی بکات و قازانجەکانی وەربگرێت.

مانگی ڕەمەزانی پیرۆزیش سەبارەت بە دەستکەوتەکانی مرۆڤ لەم ڕووەوە، چەندین حیکمەتی زۆری تێدایە، لێرەدا تەنها یەکێکیان باس دەکەین:

"پاداشتی کردەوەکان لە ڕەمەزاندا یەك بۆ هەزار زیاد دەکرێن".

ئاشکرایە کە هەر پیتێکی قورئانی پیرۆز (دە) پاداشتی هەیە کە بە (دە) چاکە بۆ مرۆڤ دەژمێررێت و، (دە) بەروبوومی بەهەشت دەست خوێنەرەکەی دەخات، هەروەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە.

بەڵام لە ڕەمەزاندا لە بریی ئەو (دە) دانە بەروبوومە (هەزار) بەروبوومی دواڕۆژ دەگرێت و بە خوێنەرانی قورئانیان دەبەخشێت و، هەر پیتێکی چەند ئایەتێکی تایبەتیی وەك: "آية الكرسي" دەرگا لە بەردەم هەزاران پاداشت و چاکەدا دەکاتەوە، بۆ ئەوەی لەودنیا لە شێوەی بەروبوومدا پێشکەش بە خوێنەرەکەی بکرێن. ئەم پاداشتە لە ڕۆژانی جومعەی ڕەمەزاندا لە زیادبووندا دەبن و، لە شەوی "قەدر"یشدا دەگەنە سی هەزار.

بەڵێ، هەر پیتێك لە پیتەکانی قورئانی پیرۆز مایەی دەستکەوتنی سی هەزار بەروبوومی هەمیشەییە، بۆ ئەوەی ببێت بە درەختێکی نوورانیی وەك درەختی تووبای بەهەشت، بە جۆرێك کە باوەڕداران ئەم مانگە پیرۆزە بە هەل بزانن و، ئەو بەروبوومە نەبڕاوە و هەمیشەییانەیان - کە ژمارەیان بە ملیۆنەهایە - دەستگیر ببێت. فەرموو بۆ خۆت سەرنج لەم بازرگانییە بەسوودە بدە و، بیر لەوانە بکەرەوە کە ڕێزی شایستەی ئەم پیتە پیرۆزانە ناگرن و، بزانە چ زەرەر و زیانێکی گەورەیان لێ کەوتووە؟!

بەم جۆرە دەرکەوت کە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز زیاتر وەك پیشانگایەکی دڵڕفێن وایە بۆ بازرگانیی قیامەت.. یاخود بازاڕێکە لەوپەڕی جموجووڵ و قازانجدایە بۆ ئەو بازرگانییە.. زەوییەکی بەپیتی بەراوە بۆ بەرهەمهێنانی

خەرمانی قیامەت.. بارانی نیسانە و گەشە بەو کشتوکاڵە دەسێنێت و فەڕی تێدەخات.. جەژنێکی پڕ لە شادی و پیرۆزە بۆ پیشاندانی بەرنامەکانی بەندایەتیی مرۆڤ لە بەردەم مەزنیی پەروەردگاری و عیززەتی خوایەتیی خوای گەورەدا..

لەبەر هەموو ئەمانە، مرۆڤ ئەرکی ڕۆژووگرتنی خراوەتە ئەستۆ، بۆ ئەوەی لەو کاتانەدا توخنی پێداویستییە ئاژەڵییەکانی دەروونی نەکەوێت، ئەو دەروونەی کە لە ئەرکەکانی سەرشانی خۆی بێ ئاگایە. وەك بڵێی مرۆڤ بەم ڕۆژووگرتنەی بوو بێت بە ئاوێنەیەك بۆ ڕەنگدانەوەی سیفەتی "صەمەدییەت"ی خواوەند. ئەوەتا پشتی لە پێداویستییە ئاژەڵییەکان هەڵکردووە و، لەناو دۆخێکی مەلائیکەت ئاسادایە. یاخود بووە بە کەسێکی قیامەتخواز و ڕۆحێکی بەرجەستەی ئاشکرا. ئەمەش بەهۆی وازهێنانێکی کاتی لە پێویستییە دنیاییەکانی و بەشداری کردنی لە بازرگانییەکی قیامەتیدا.

بەڵێ، ڕەمەزانی پیرۆز لەم دنیا فانی و تەمەنە کورت و ژیانە کەمخایەنەدا، بۆ ڕۆژوانەتی دەبێت بە مایەی دەستخستن و دابینکردنی تەمەنێکی بەردەوام و ژیانێکی هەمیشەیی.

کەواتە، یەك مانگی ڕەمەزان، دەتوانێت بەروبوومی تەمەنێکی هەشتا ساڵی بە مرۆڤی ڕۆژوانەتی ببەخشێت. خۆ ئەوەی کە قورئانی پیرۆز لەبارەی "شەوی قەدر"ەوە ڕایگەیاندووە و فەرموویەتی: "ئەم شەوە لە هەزار مانگ بە فەڕ و خێرترە".. بە هێزترین بەڵگەی ئەم ڕازەیە!

وەك چۆن پادشا لە سەرانسەری ماوەی فەرمانڕەوایەتیی خۆیدا، یان هەموو ساڵێکی ئەو سەردەمە، چ بە ناوی چوونە سەر تەختەوە، یان بە هەر بۆنە و یادێکی تر، چەند ڕۆژێك وەك بۆنە و جەژن بۆ دانیشتووانی وڵاتەکەی

دەستینیشان دەكات و، لەو ڕۆژانەدا پادشا بە پێی یاسا عادەتی‌یەكانی لەگەڵ ڕەعیەتە دڵسۆزەكانیدا ڕەفتار ناكات، بەڵكو بە خەڵات و بەراتی تایبەتی بەهرەمەندیان دەكات و، ڕاستەوخۆ لە كۆشك و بارەگای خۆیدا میوانداریـیان بۆ دەسازێنێت و، سایەی كەرەم و بەخششیان لەسەر ڕادەگرێت و، بە چاوی ڕێزەوە بۆیان دەڕوانێت ..

خواوەندی بەدەسەڵاتی هەمیشەییش بە هەمان جۆر لەگەڵ بەندەكانیدا مامەڵە دەكات، ئەو خوایەی كە خاوەنی بەخشش و مەزنی‌یە و، پادشای ئەزەل و ئەبەدە و، سوڵتانی شكۆمەندی هەژدە هەزار جیهانە..

ئەوەتا ئەو خواوەندە گەورەیە فەرمانە پڕ لە دانستە بەرزەكانی و قورئانە پیرۆزەكەی خۆی - كە ڕووی لە هەزاران جیهانە - لەم مانگە پیرۆزەدا نازڵ كردووە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە جێی خۆیەتی و خواستێكی "دانست"ی خواوەندە كە مانگی ڕەمەزان وەك جەژن و بۆنەیەكی شادمان و تایبەتیی خوایی و، پیشانگایەكی دڵڕفێنی پەروەردگار و، كۆڕێكی ڕۆحانیی بەسام و شكۆ دانراوە.

جا لەبەر ئەوەی مانگی ڕەمەزان لە دیمەنی ئەو بۆنە و جەژنە پڕ لە شادی و خۆشی‌یانەدا خۆی دەنوێنێت و، بۆ ئەوەی خەڵكی - تا ڕادەیەك - لە سەرقاڵی‌یە نزم و ئاژەڵی‌یەكان دوور بن و بەسەریاندا بەرز بینەوە، لەبەر هەموو ئەمانە، پێویستە فەرمانی ڕۆژوو گرتنی تێدا دەربكرێت..

كاملبوونی ئەو ڕۆژووەش بەوە دەبێت كە هەموو هەستەكانی مرۆڤ (چەشنی: چاو، گوێ، دڵ، بیر و ئەندێشە) وەكو "گەدە" هەریەكەیان لە ڕۆژووی تایبەتیی خۆیاندا بن. واتە ئەو هەستانە لە شتی حەرام و لاوەكی بپارێزرێن و، هەریەكەیان بەرەو بەندایەتیی تایبەتیی خۆیان ئاراستە بكرێن.

بۆ نموونە:

مرۆڤ "زمان"ی بۆ ڕۆژوو گرتن لە درۆ و غەیبەت و قسەی نابەجێ ڕابهێنێت و، بە خوێندنی قورئان و، یادی خوا و، تەسبیحات و، سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ و، هەموو جۆرەکانی تری زیکر، زمانی پاراو بکات..

"چاو"ی لە شتی حەرام بپارێزێت و، بە چاوی پەند وەرگرتن بۆ هەموو شتێك بڕوانێت..

"گوێ" لە وتەی ناشیرین ڕانەگرێت و، قورئانی پیرۆز و "حەق"ی پێ ببیستێت..

هەر بەم جۆرە، گشت هەستەکانی تریشی لەسەر جۆرە ڕۆژوو گرتنێکی تایبەتی ڕابگرێت.

ئاشکرایە ئەو "گەدە"یەی کە وەك کارگەیەکی مەزن وایە، گەر بە ڕۆژوو گرتن لەکار بخرێت، ئەوا لەکارخستنی کارگە بچووکەکانی تر زۆر ئاسان دەبێت!

◆ **سەرنجی هەشتەم**

یەکێك لەو حیکمەتە زۆرانەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، کە پەیوەندییان بە ژیانی خۆیی مرۆڤەوە هەیە، بە کورتی بەم جۆرەی خوارەوەیە:

گرنگترین و کاریگەرترینی جۆرەکانی چارەسەر لە "پارێز"دایە، چ پارێزی ماددی چ مەعنەوی.

ئەوەتا پارێز لە زانستیی پزیشکیدا چەسپاوە، چونکە هەرکات نەفسی مرۆڤ لە خواردن و خواردنەوەدا ئەوپەڕی سەربەستیی پێ بدرێت، ئەوا لە ژیانی کەسییدا دووچاری گەلێ زیانی ماددی دەبێت..

بەربەرەڵایی بۆ ژیانی مەعنەویش هەر بە هەمان جۆرە، چونکە ئەگەر "دەروون" بێ بیرکردنەوە لە حەڵاڵ و حەرام هەرچییەکی بێتەڕێ هەڵی بلووشێت، ئەوا ژیانی مەعنەویی تێکدەچێت و ژاراوی دەبێت، هەتا وای لێ

دێت "دەروون"ی ئەو مرۆڤە گوێڕایەڵی "دڵ" و "ڕۆح" نابێت و ملیان بۆ کەچ ناکات، ئیتر بۆ خۆی جڵەوی خۆی بەدەستەوە دەگرێت و، بەوپەڕی سەرکەشی لە ژیاندا ڕەفتار دەکات و، مرۆڤ بەرەو ئارەزووە بەدەکانی خۆی ڕادەپێچێت، بێ ئەوەی دەستەڵاتی خودی مرۆڤەکەی بەسەرەوە بمێنێت.

بەڵام لە ڕەمەزانی پیرۆزدا "دەروون" بەهۆی ڕۆژووەوە لەسەر جۆرە پارێزێك ڕادێت و، لە پێناوی پاکبوونەوە و گەشەکردنیدا بە لێبڕانەوە تێدەکۆشێت و، فێری گوێڕایەڵیی فەرمانەکان دەبێت. ئیتر تووشی ئەو نەخۆشی‌یانە نابێت کە لە پڕبوونی گەدەو، خۆراك بەسەر خۆراکدا پەیدا دەبن و، توانای فەرمانبەرداری و ملکەچی بۆ فەرمانەکانی شەرع بەدەست دەهێنێت..

ئنجا لەبەر ئەوەی کە بە بۆنەی ڕۆژووەوە خۆی لە خواردنی حەڵاڵ پاراستووە، ئەوا لە حەرامیش خۆی دەپارێزێت و، لێدەبڕێت تاکو ژیانی مەعنەویی خۆی نەشێوێنێت و ڕوونی‌یەکەی نەشڵەقێنێت و لێڵی نەکات.

پاشان زۆربەی کەسانی گرۆی مرۆڤ گەلێ جار گرفتاری برسێتی دەبن. کەواتە پێویستیان بە خۆڕاهێنان هەیە بە برسێتی‌یەك کە مرۆڤ لەسەر ئارامگرتن ڕابهێنێت.

جا ڕۆژووی ڕەمەزان بریتی‌یە لە ڕاهاتن و خۆڕاگرتن لەسەر برسێتی‌یەك پازدە سەعات دەخایەنێت، یاخود بیست و چوار سەعات بۆ ئەوانەی کە فریای پارشێو نەکەوتوون.

کەواتە ڕۆژوو چارەسەرێکی کاریگەرە بۆ سەراسیمەیی و بێ ئۆقرەیی مرۆڤ، کە هۆی پتر کردنی بەڵا و گرفتاری‌یەکانی مرۆڤن.

"گەدە"ش وەك کارگەیەك وایە کە چەندین کرێکاری کارگوزاری هەیە و، لە مرۆڤیشدا گەلێ ئامێر هەن کە لەگەڵ گەدەدا پەیوەندی‌یان هەیە.

جا ئەگەر "دەروون" بە شێوەیەکی کاتی و بۆ ماوەی مانگێك پەکی سەرقاڵی‌یەکانی خۆی نەخات و وازیان لێ نەهێنێت، ئەوا هەموو ئەو کارگوزار و کرێکارانە بە ئیشی خۆیەوە سەرقاڵ دەکات و، پەرستشە تایبەتی‌یەکانی خۆیانیان لەبیر دەباتەوە و، دەیانخاتە ژێر فەرمان و دەستەڵاتی خۆیەوە. ئیتر بەم پێیە سەر لەو ئامێر و هەستانە دەشێوێنێت و، بە گرم و هۆڕی جەرەوپێچەکانی ئەو کارگەیە و چەرە دوو کەڵەکەی، حەوانەوە و ئاسوودەییان لە لا هەڵدەگرێت و، سەرنجی هەموویان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت و، فەرمانبەری‌یە بەرزەکانیان - بە جۆرێکی کاتی - لەبیر دەباتەوە.

هەر لەبەر ئەم ئەنجامەش بووە کە زۆر کەس لە ئەولیا و پیاوچاکان خۆیان لەسەر خواردن و خواردنەوەی کەم ڕادەهێنا، تاکو بە پلەکانی "کاملی"دا سەربکەون و بەرز ببنەوە.

بەڵام بە هاتنی مانگی ڕەمەزان، ئەو کرێکارانە هەست دەکەن کە تەنها لە پێناوی ئەو کارگەیەدا دروست نەکراون. بەڵکو ئەو ئامێر و هەستانەی مرۆڤ، چەند چێژ و لەزەتێکی بەرزی ڕۆحانی و مەلائیکەت ئاسایان لەم مانگەدا دەست دەکەوێت و، لە بریی ئەو ڕابواردنە بێ تام و نزمانە، ڕوو لەو چێژ و لەزەتە ڕۆحانی‌یە بەرزانە دەکەن.

هەر لەبەر ئەوەشە کە دەبینیت ئیمانداران لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا چەندین جۆری نوور و بەرەکەت و دڵخۆشیی مەعنەوی‌یان - هەر کەسەو بە پێی پلەی خۆی - دەستگیر دەبێت و، هەر لەم مانگە پیرۆزەدا "دڵ" و "عەقڵ" و "ڕاز" و لایەنە ناسك و نیانەکانی تری هاوچەشنیان، چەندین پلە بەرز دەبنەوە و، پیت و بەرەکەتیان دەست دەکەوێت..

جا هەرچەندە "گەدە" لە شین و گریاندا بێت و هەنسك بدات، ئەمان بە بێگەردی و میهرەبانی‌یەوە پێی پێدەکەنن!

◆ سەرلجی لۆهەم

چەند حیکمەتێك لە ڕۆژووی ڕەمەزاندا هەن، سەبارەت بەوەی کە پەروەردگاریتی‌یە وەهمی‌یەکەی "دەروون" ڕاستەوخۆ دەشکێنێت و، بەندایەتی‌یەکەی بۆ خوا پێ دەناسێنێت و، وای لێ دەکات زەبوونیی خۆی لە بەردەم پەروەردگاریتیی خوادا دەربڕێت.

وا ئێمەش یەکێك لەو حیکمەتانە باس دەکەین:

"دەروون" نایەوێت خوای خۆی بناسێت، بەڵکو دەیەوێت لە شێوەی فیرعەونایەتی‌یەکی سەرکەشانەدا لافی پەروەردگاریتی لێ بدات. ئنجا لەسەر ئەم لاف لێدانەشی تا ئەشکەنجە و ئازار بدرێت، سوودێکی ئەوتۆی نابێت و، ڕەگی ئەو پەروەردگاریتی‌یە وەهمی‌یەی هەر تێدا دەمێنێت و، هیچ شتێك ئەو ڕەگە نابڕێت و لە لێدانی ناخات و سەری پێ دانانەوێنێت، مەگەر برسێتی!

بەم جۆرە، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان مشتەکۆڵێکی ڕاستەوخۆی جەرگبڕ دەهاوێتە سەر لایەنە فیرعەونی‌یەکەی دەروون و، بە جارێ هەموو کەشوفش و لاف و گەزافێکی دەشکێنێت و، زەبوونی و لاوازی و هەژاری‌یەکەی پێ دەردەخات و، بەندایەتی‌یەکەی بۆ پەروەردگار پێ دەناسێنێت.

لە یەکێك لە ڕیوایەتەکانی فەرموودەیەکدا هاتووە کە:

خوای گەورە فەرمووی بە "دەروون":

(من کێم و تۆ کێیت)؟

لە وەڵامدا وتی:

(من منم و، تۆش تۆیت)!

خوای گەورەش خستیە دۆزەخەوە و ئازاری دا. پاشان هەمان پرسیاری لێ کردەوە، کەچی هەر لە وەڵامدا وتی:

(من منم و، تۆش تۆیت)!

جا هەرچەندە ئەشکەنجە و ئازاری جۆراوجۆری دەدا، ئـەو هـەر وازی لـە خۆویستیی خۆی نەهێنا..

پاشان خواوەند بە برسێتی ئازاری دا (واتە بە برسێتی هێشتیەوە) ئنجا لێـی پرسیـیەوە:

(من کێم و تۆ کێیت)؟

دەروونیش وتی:

(تۆ پەروەردگاری میهرەبانی منی و، منیش بەندەی زەبوونی تۆم)!

اللهم صلِّ على سيدنا محمد صلاة تكون لك رضاءً، ولحقه أداءً، بعـــدد ثواب حروف القرآن في شهر رمضان، وعلى آله وصحبه وسلم.

﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ العِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ۝ وَسَلامٌ عَلَـــى الْمُرْسَـــلِين ۝ وَالْحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِين﴾ (الصافات: ١٨٠-١٨٢).

آمین.

داوای لێبوردن:

ئەم پەیامەم گەلــێ بە پەلـە و تەنـها لـە مـاوەی چـل دەقیقـەدا دانـاوە! جـا لەبـەر ئـەوەی مـن و نووســەری ڕەشنووســە کە هەردووکمان نەخۆش و ماندوو بووین، ئەوا دوور نیـیـە هـەندێ قسوور و ناتەواوی لـە پەیامەکەدا بیێـت. لەبـەر ئـەوە، داوای لێبوردن لە برایانمان دەکەین و، ڕاستکردنەوەی هەر شتێکیشیان بە گونجاو زانی تکایە با ڕاستی بکەنەوە. (دانەر)

بریسکەی نۆزدەهەم:

# پەیامی دەستپێوەگرتن ( الإقتصاد)

(ئەم پەیامە، گرۆی مرۆڤ بۆ دەستپێوەگرتن و قەناعەت هان دەدات و، لە ئەنجام و زیانەکانی ئیسراف و هەڵەخەرجیش بێداریان دەکاتەوە)

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلا تُسْرِفُوا﴾ (الأعراف:٣١)

(ئەم ئایەتە پیرۆزە دەرسێکی گەلێ گرنگ دەڵێتەوە و، بە ڕەوانی و دانایی و لە شێوازی ئەمر و فەرماندا ڕێنمایی ئادەمیزاد بۆ لای دەستپێوەگرتن دەکات و، نەهی‌یەکی ڕاستەوخۆشی سەبارەت بە ئیسرافەوە تێدایە. ئەم مەسەلەیەش حەوت سەرنجی وردی لەخۆ گرتووە).

❑ سەرنجی یەکەم:

بەدیهێنەری میهرەبان بەرامبەر بەو بەخشش و نیعمەتە زۆرانەی کە بە گرۆی مرۆڤی بەخشیون، داوای شوکر و سوپاسگوزاری‌یان لێ دەکات. کەچی "هەڵەخەرجی"ی مرۆڤ پێچەوانەی شوکرانەبژێریی خواوەندە و،

جۆرە گاڵتەکردنێکی بەدئەنجامی زیانبەخشە بەرامبەر بە نیعمەتەکانی. بەڵام "دەستپێوەگرتن" هەروەك ڕێزنانە لەو نیعمەتانە، بە هەمان جۆر ئەنجامەکانیشی بۆ مرۆڤ بەپیت و سوودبەخشن.

بەڵێ، "دەستپێوەگرتن" هەروەك شوکرێکی مەعنەوییە، لە هەمان کاتدا ڕێزنانیشە لەو میهرەبانییەی خوای گەورە کە لە دووتوێی نیعمەت و بەخششەکانیدان. هەروەها هۆیەکی بێگومانی بەرەکەتە و، چەشنی پارێزمایەی لەشساغییە و، ڕێی گەیشتنە بە عیززەت و سەربەرزی بە بۆنەی خۆ دوورگرتن لە ڕسوایی و زەلیلیی سواڵی مەعنەوی و، هۆکارێکی بەهێزە بۆ هەست پێکردنی ئەو تام و چێژانەی کە لە ناوەندی نیعمەتەکاندان و، هۆیەکی گەلێ توندوتۆڵ و پتەویشە بۆ چەشتنی لەزەتی حەشاردراوی نێوان ئەو چەشنە نیعمەتانەی کە بە ڕواڵەت بێ تام و بێ لەزەت دیارن!

جا لەبەر ئەوەی "ئیسراف" پێچەوانەی ئەو دانستە ناوبراوانەیە، ئەوا ئاکامی گەلێ زیانبەخشی لێ دەبێتەوە.

❑ سەرنجی دووهەم:

بەدیهێنەری دانا جەستەی مرۆڤی لە شێوەی کۆشکێکی تەواو کامڵ و بە چەشنی شارێکی یەکجار ڕێکوپێك بەدی هێناوە. ئنجا "هەستی چەشتن"ی ناودەمی ئەوی وەك دەرگاوان و پاسەوان داناوە و، لوولە و دەمارەکانی لەشی ئەویشی بە وێنەی تەلی تەلەفۆن و تەلگراف دروست کردووە (چونکە هەواڵ بە یەکدانی نێوان "هێزی چەشتن"ی ناو زمان و "گەدە" - کە لە مەڵبەندی قەوارەی مرۆڤدایە - لە ڕێی ئەوانەوە ئەنجام دەدرێت)..

ئەوەتا هەر شتێك دەچێتە ناو دەمەوە یەکسەر هەستەوەری "چەشتن" بە گەدەی ڕادەگەیەنێت و، ڕێ لەو شتانەش دەگرێت کە زیانیان تێدایە و، جەستەی مرۆڤ پێویستی پێیان نییە. ئیتر ڕێ بەو شتانە نادات بڕۆنە ناو

گـەدە و لەشـەوە و، دەریاندەکـات و، پێیـان دەڵێـت: "چوونـە ژوورەوە قەدەغەیە"! تەنانەت هێندەی پێ ناچێت بە پاڵ پێوەنان و بێز لێکردنەوە تف لـە ڕووی هەموو ئەو شتانە دەکات کە سوودیان بۆ لـەش تێدا نییـە، چ جـای ئەوانەی کە تاڵ و زیانبەخشن!

جا مادەم "هەستی چەشتن"ی ناو دەم ئەرکی پاسـەوانێتی لـە ئەستۆدایە و، لە ڕووی بەڕێوەبردنی جەستەشەوە "گەدە" بە فەرمانڕەوا و سەرگەورەی لەش دادەنرێـت، ئـەوا ئـەو دیارییـەی کـە پێشـکەش بـە فـەرمانڕەوای کۆشـکێك دەکرێت، گەر نرخەکەی سەد پلە بێـت، تەنـها پێنجیـان ڕەوایـە بـەو پاسـەوانە بدرێت، تاکو لە خۆی بایی نەبێت و، کاری ئەستۆی لە یاد نەچێت و، دەرگا نەخاتە سەرپشت بۆ هەر گێرەشێوێنێك کە قورشێکی زیاتر بەرتیلی بداتێ!

ئێستا لەسەر بناغـەی ئـەم نهێنییـە، وا گریمـان دەکـەین کـە دوو پاروومـان لەبەر دەستدایە..

پاروویەکیان لە ماددەیەکی بەپێزی سوودبەخشە بۆ لـەش - وەك هێلکـە و پەنیر - و نرخـی یـەك قورشـە.. بـەڵام پاروەکـەی تریـان شـیرینییەکە لـە جۆرێکی نایاب کە بایی دە قورشە..

لـە ڕاستیدا ئـەم دوو پـاروە پێش ئەوەی بڕۆنـە نـاو دەمـەوە یەکسـانن و جیاوازی یان نییە. هـەروەها لـە دوای ئەوەش کە ڕۆشتنە نـاودەم و لـە ڕێـی قوڕگەوە بۆ ناو گەدە دابەزین، لە ڕووی گەشەپێدان و خۆراك بەخشـینیان بـە جەستە، هەردوو کیان یەکسانن. تەنانـەت پـاروە پەنیرەکـەی کـە نرخـی یـەك قورشە لە چاو پاروەکەی تردا گەلێ باشـتر خـۆراك بـە لـەش دەبەخشێت و گەشەی پێ دەدات.

کەواتە جیاوازیی ئەو دوانە تەنـها لـە مـەودای چاودێری و ڕازی کردنـی "هێزی چەشتن"ی ناو زماندایە، کە نیو خولەکیش ناخایەنێت!

دەبا ئیتر لەم نموونەیەوە پەی بە ڕادەی زیانی "ئیسراف" ببرێت و، مەودای ئەو بێ نرخی‌یەش لێکبدرێتەوە کە لە پێناوی بەدەستهێنانی لەزەتێکی نیو دەقیقەییدا دە قورش لە بریی یەك قورش خەرج بکرێت!

گەر بەم پێ‌یە نۆ هێندەی ئەو دیاری‌یانەی کە دەبێ بە فەرمانڕەوای کۆشکەکە ببەخشرێن، بە پاسەوانی دەرگاکە بدرێن، بێ هیچ گومانێك دووچاری لەخۆبایی بوون و چاوبرسێتیی دەکات و، لە ئەنجامدا هانی دەدات کە بڵێت:

"تەنها هەر خۆم فەرمانڕەوام"!

ئیتر هەر کەسێك بەخششێکی زۆرتر و لەزەتێکی زیاتری بداتێ، بەرەو ناوەوە بەڕێی دەکات! بەم ڕەفتارەی ئێرەشی ڕێسای ئەوێ تێکدەدات و، ئاگرێکی بە کڵپە و بڵێسەی تێدا هەڵدەگیرسێنێت و، خاوەنەکەی ناچار دەبێت کە هاوار بکات و بڵێت:

"خێرا فریام بکەون.. بە زوویی بمگەیەننە لای پزیشك، تاکو بڵێسەی سەختی ئەم تایەم بۆ بکوژێنێتەوە".

کەواتە "دەستپێوەگرتن" و "قەناعەت" بە تەواوەتی لەگەڵ دانستی خوای گەورەدا تەبا و گونجاون، چونکە بە وێنەی پاسەوانێك دەڕواننە "هێزی چەشتن" و، بەو ڕوانینە مامەڵەی لەگەڵ دەکەن و، لەم ڕێیەشەوە ئەو دەرگاوانە لە سنووری خۆی ڕادەگرن و، بە ئەندازەی ئەرکی ئەستۆی خۆی پاداشتی خەڵات دەکەن..

بەڵام "ئیسراف" لەبەر ئەوەی بە پێچەوانەی ئەو دانستەوە ڕەفتار دەنوێنێت، ئەوا مرۆڤی هەڵەخەرج هەر بە زوویی زللەی بەئازاری ئەو هەڵەیەی دەچێژێت، چونکە لە ئەنجامی ئیسرافی ئەو کەسەوە خۆراکە جۆراوجۆرەکان لەناو گەدەدا بە چەشنێکی ئازاربەخش تێکەڵ بە یەکتری

دەبن و، ئەم ئازارانەش ئیشتیهای ڕاستەقینەی خواردن لادەبەن، ئەو کاتەش بە ئیشتیهایەکی درۆینەی دەستکرد خۆراکە جۆراوجۆرەکان دەخوات. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە بە قورسی و سەختی ئەو خواردەمەنی‌یانەی بۆ هەرس بکرێت!

□ سەرنجی سێهەم:

نەختێك پێش ئێستا لە سەرنجی دووهەمدا وتمان:

"هێزی چەشتن ئەرکی پاسەوانێتیی دراوەتێ".

ئەمە گەلێ ڕاستە سەبارەت بەو بێ ئاگایانەی کە هێشتا لە ڕووی "گیان"ەوە پلەیان بەرز نەبووەتەوە و، بە پلیکانەی شوکرانەدا سەرنەکەوتوون و، بەرەوپێش نەڕۆیشتوون.

بەڵێ، نابێ پەنا بۆ "ئیسراف" ببرێت و لە پێناوی لەزەت بەخشین بە "هێزی چەشتن"ی ناو زماندا دە هێندەی نرخی پێویست، بۆ خواردن خەرج بکرێت.

بەڵام "هێزی چەشتن" بەلای شوکرانەبژێرانی ڕاستەقینە و ئەهلی دڵ و حەقیقەت و کەسانی خاوەن بینایی ڕوونەوە، بە وێنەی چاودێر و پشکنەرێکی چێشتخانەکانی میهرەبانیی خوای گەورە وایە (وەك لە بەراوردەکەی وتەی شەشەمدا ڕوون کراوەتەوە). چونکە سەبارەت بەوان، ئەو کارەی کە "هێزی چەشتن" ئەنجامی دەدات و لە ڕێی تەرازووە ورد و هەستیارەکانیەوە - کە بە ژمارەی خواردەمەنی‌یەکانن - نرخ و بەهای نیعمەتەکانی خواوەند هەڵدەسەنگێنێت و، ئاشنای سەرجەم جۆرە جیاجیاکانی دەبێت، تەنها لە پێناوی ئەوەدایە "گەدە" و "لەش" بە چەشنێك لەو نیعمەتانە ئاگادار بکرێنەوە کە شوکرانەیەکی مەعنەوی بگەیەنێت و پێشکەشی خواوەندی بەخشندەی بکەن.

ئەركی ئەستۆی "هێزی چەشتن" تەنها بە چاودێریی ماددیی لەشەوە بەند نی‌یە، بەڵكو حوكمی ئەو كارەی لە سەرشانی ئەودایە گەلێ لە هی گەدە بەرزترە و، پلە و پایەشی بڵند و باڵاترە، چونكە چاودێری و سەرپەرشتیی "دڵ و گیان و ژیری"شی لە ئەستۆدایە.

جگە لەمەش ئەو "هێزی چەشتن"ە، بە مەرجی ئیسراف نەكردن و، بە نیازی ئاشنایی و ناسینی جۆرەكانی نیعمەتی خوای گەورە و، بۆ مەبەستی "ئەنجامدانی ئەركی شوكرانەبژێری"، دەتوانێت لە بەدەستهێنانی تام و لەزەتەكانیدا بەردەوام بێت، بە مەرجێ ئەو نیعمەتانە حەڵاڵ و ڕەوا بن و، هۆیەك نەبن بۆ سواڵ و زەلیلی و ڕسوایی..

واتە دەتوانین بۆ نرخ شناسیی نیعمەتەكان و بۆ مەبەستی "شوكرانەبژێری" زمان و هێزی چەشتنمان بخەینەكار.

وا ئەم ڕووداوەتان بۆ دەگێڕمەوە كە ئاماژە بۆ ئەو ڕاستی‌یە دەكات و، بە یەكێك لە كەرامەتەكانی شێخی گەیلانی - قُدِّسَ سِرُّهُ - دادەنرێت:

پیرەژنێكی هەست ناسكی دڵنەرمی میهرەبان كوڕێكی تاقانەی هەبوو، لەسەر دەستی شێخی گەیلانیدا - قُدِّسَ سِرُّهُ - خەریكی پەروەردە و پێگەیشتن بوو..

ڕۆژێكیان پیرەژنەكە ڕۆشت بۆ سەردانی كوڕەكەی. بینیی خەریكی خواردنی لەتە نانێكی ڕەشەوەبووی وشكە. هێندەش سەرگەرمی ئەنجامدانی وەرزشی ڕۆحی‌یە كە بە جارێ جەستەی لاواز بووە!

ئەم دیمەنە، شەفەقەتی دایكی میهرەبانی بزواند و، گەلێ بەزەیی بە حاڵیدا هاتەوە. لەبەر ئەوە، ڕۆشت بۆ لای شێخی گەیلانی، تاكو سكاڵای حاڵی كوڕەكەی لە لا بكات. كە گەیشتە ئەوێ، بینیی شێخ خەریكی خواردنی مریشكێكی برژاوە!

هێندەش هەست نەرم و دڵ ناسك و زمان شیرین بوو کە خۆی پێ ڕانەگیرا و، وتی:

"ئەی شێخی بەڕێز! کوڕەکەم وەختە لە برساندا بمرێت، کەچی تۆش وا خەریکیت مریشك دەخۆیت"؟!

شێخیش لە بەرچاوی پیرەژنەکەدا ڕووی لە مریشکە برژاوەکە کرد و، پێی وت: "قومي بإذن الله". یەکسەر خوای گەورە مریشکەکەی سەرلەنوێ زیندوو کردەوە و، هاتە دەرەوەی سینی‌یەکەی بەردەستی شێخ.

ئەم هەواڵە لە لایەن گەلێ زانای باوەڕ پێ کراوەوە بە تەواتوری مەعنەوی پێمان گەیشتووە[1] و، کەرامەتێکی شێخی گەیلانی - قُدِّسَ سِرُّهُ - دەردەخات کە لە سەرجەمی جیهاندا کەرامەتەکانی ناوبانگیان هەیە.

یەکێك لەو قسانەی کە شێخی گەیلانی بەو پیرەژنەی وت، ئەوە بوو کە:

هەر کات کوڕەکەت گەیشتە ئەم پلەیە، با ئەویش مریشك بخوات.

ناوەرۆکی ئەم فەرمانەی شێخی گەیلانی - قُدِّسَ سِرُّهُ - بریتی‌یە لەوەی کە هەر کاتێك "گیان"ی کوڕەکەت بوو بە فەرمانڕەوای "جەستە"ی و، "دڵ"یشی جڵەوی "دەروون"ی بەدەستەوە گرت و، "ژیری"شی بەسەر "گەدە"یدا زاڵ بوو؛ لەبەر "شوکرانەبژێری"ی خوای گەورە بە دوای "لەزەت"دا دەگەڕا.. ئەو کاتە، هەر خواردنێکی حەڵاڵی بەتام ولەزەت دەخوات با بیخوات، نۆشی گیانی بێت!

---

(١) قال اليافعي رضي الله عنه: صحَّ بالسند المتصل إلى الشيخ القطب عبدالقادر الجيلاني رحمه الله: أن أم شاب عنده دخلت عليه وهو يأكل في دجاجة، فأنكرت أكله الدجاجة وإطعام ابنها أرذل الطعام، فقال لها: إذا صار ابنك بحيث يقول لمثل هذه الدجاجة: قومي بإذن الله، فقامت ولها أجنحة وطارت بها حق له أن يأكل الدجاج. (الفتاوى الحديثية لابن حجر ص ٨٠).
(وەرگێڕ لە کتێبی: "اللمعات"ەوە ص ٢١٤ هێناویەتی)

❑ سەرنجی چوارەم:

مرۆڤی دەستپێوەگر دووچاری هەژاری و دەستکورتیی گوزەران نابێت، وەك لە فەرموودەی پیرۆزی: "لا يعول من اقتصد"ەوە[١] دەردەکەوێت..

بەڵێ، بەڵگەی گومانبڕی زۆر و زەبەندە هەن لەسەر ئەوەی کە دەستپێوەگرتن هۆکارێکی بێگومانی نازڵبوونی بەرەکەتە و، بناغەیەکی پتەوە بۆ ژیان و گوزەرانی باشتر. لەسەر ئەمەش نموونەیەکتان بۆ دەهێنمەوە کە لە خۆمدا بینیومە و، هەموو ئەو کەسانەش شایەتن لەسەری کە لەم خزمەتگوزارییەدا هاوکارییان کردووم و، بە ئیخلاس و بێگەردی هاوڕێم بوون:

هەمیشە بەهۆی دەستپێوەگرتنەوە، چ من و چ هاوڕێکانم دە قات بەرەکەتمان دەست دەکەوت. تەنانەت چەند کەسێك لەو سەرۆك هۆزانەی کە نۆ ساڵ پێش ئێستا[٢] لەگەڵ مندا بۆ شاری "بوردوور" ڕەهەندە کرابوون، گەلێ هەوڵیان دا و جەختیان لێ کردم کە زەکاتەکانیان لێ وەربگرم، تاکو لەبەر کەمیی پارەکەم گرفتاری "نەبوونی" نەبم و، زەلیلیم بەسەردا نەیەت.

منیش بەو سەرۆك هۆزە دەوڵەمەندانەم وت:

"هەرچەند پارەکانم کەمن، بەڵام من دارای قەناعەت و دەستپێوەگرتنم و، لە ئێوە گەلێ دەوڵەمەندترم"!

بەم جۆرە، داخوازییە دووپاتبووەکانیانم گێڕایە دواوە.

شایانی باسە کە هەندێك لەو کەسانەی ویستیان زەکاتیان لێ وەربگرم، لەبەر ئەوەی پابەندی "دەستپێوەگرتن" نەبوون، پاش دوو ساڵ "قەرزاری"

---

(١) "ما عال من اقتصد". رواه أحمد عن ابن مسعود. بڕوانە: (كشف الخفاء ٢/١٨٩، ١/١٥٨).

(٢) واتە: ساڵی ١٩٢٦ز. (وەرگێڕ)

بەخەی پێ گرتن! بەڵام ئەو پارە کەمەی من - سوپاس بۆ خوا - بەهۆی بەرەکەتی دەستپێوەگرتنەوە، تاکو حەوت ساڵی دوای ئەوەش بەشی کردم و، ئاوی ڕووم دانەتکایە خوار و، ناچاری ئەوەی نەکردم پێویستی و نەبوونیم لای خەڵکی بدرکێنم و، دەستووری ژیانیشمی لێ نەشێواندم، کە بریتی‌یە لە "پێویست نەبوونم بە خەڵکی".

بەڵێ، هەر کەسێك دەست پێوە نەگرێت گەلێ نزیکە بەرەو هەڵدێری زەلیلی بکەوێتە خوارەوە و، وەختە پێیشی بۆ سواڵ و ڕسوایی مەعنەوی بخلیسکێت!

ئەو سامانەی کە لەم سەردەمەی خۆماندا لە زیادەڕەوی و ئیسرافدا خەرج دەکرێت، سەروەت و سامانێکی گەلێ زۆر و زیادە و، هەندێ جار شەرەف و کەرامەتیشی لە پێناودا دەدرێت بە بەرتیل! تەنانەت کاتی وا هەیە موقەددەساتی ئایینی زەوت دەکرێت و لە بەرامبەریەوە چەند پارچە دراوێکی بەدی شووم دەبەخشرێت. واتە ئەو کەسە، لەسەر حسابی سەدان لیرەی دراوی مەعنەوی، تەنها چەند قورشێکی ماددی وەردەگرێت!

بەڵام مرۆڤ گەر تەنها بایەخی بە پێداویستی‌یە ناچاری‌یەکانی ژیانی بدایە و، ئەم پێداویستی‌یانەشی کەم بکردنایەتەوە و، گشت خەم و بیرێکی بە چڕی و خەستی لەو گۆشەیەدا جەم ببونایە، ئەوا ڕۆزی‌یەکی وەهای دەستگیر دەبوو کە - بێ ئەوەی لە حسابیشیدا بووبێت - ژیانی بۆ مسۆگەر بکات، بەپێی ناوەرۆکی ئایەتی پیرۆزی: ﴿إِنَّ اللهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُوالقُوَّةِ الْمَتِين﴾ (الذاريات:٥٨). هەروەها ڕاشکاویی ئەم ئایەتە پیرۆزەش کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الأَرْضِ إِلاَّ عَلَى اللهِ رِزْقُهَا﴾ (هود:٦) پەیمان و بەڵێنێکی بێ گومانی لەسەر ئەو ڕۆزی لەئەستۆ گرتنە، ڕاگەیاندووە.

بەڵێ، ڕۆزی دوو بەشە:

*بەشی یەکەم:* ڕۆزیی ڕاستەقینەیە، کە ژیانی مرۆڤی لەسەر بەندە و، بە حوکمی ئەم ئایەتە، پەروەردگار خستوویەتیە ژێر چاودێری و پەیمان و بەڵێنی خۆی. بارودۆخ هەرچۆنێك بێت و بێ ئەوەش کە مرۆڤ ناچار ببێت ئایین و شەرەف و عیززەتی لە پێناودا بدۆڕێنێت، دەتوانێت ئەم بەشەی دەست بکەوێت، بە مەرجێ ویست و ئیختیاری هەڵە و سەرەڕۆی مرۆڤەکە لەو ڕۆزییەدا خۆی هەڵنەقورتێنێت.

*بەشی دووهەم:* ڕۆزیی مەجازییە. هەرکەسێك بە شێوەیەکی هەڵە و خراپ ئەم بەشە بەکار بهێنێت، ناتوانێت دەست لەو پێداویستییانە هەڵبگرێت کە سەبارەت بەو ناچارەکی نین، بەڵام لە ئەنجامی گرفتاربوونی بە لاسایی کردنی خەڵکییەوە، بۆ ئەو وەکو پێویستیی ناچارییان لێ هاتووە.

جا لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە ڕۆزییە بەڵێنەکەی پەروەردگار - بۆ خستنە ئەستۆی ڕۆزی - نایگرێتەوە، ئەوا لەم سەردەمەدا بە نرخێکی گەلێ گران دەستگیر دەبێت، چونکە دەبێ ئەو کەسە بە زەلیلی ڕازی ببێت و لە پێشدا عیززەتی خۆی لەپێناودا بەخت بکات. بەڵکو هەندێ جار دەیگەیەنێتە ڕادەی کەوتنە خوارەوە لە هەڵدێری سواڵی مەعنەوی و دابەزین بۆ ئاستی ماچکردنی قاچی کەسانێکی نزمی بێ نرخ. تەنانەت جاری وا هەیە تاکو موقەددەساتی ئایینیی خۆیشی - کە نووری ژیانی هەمیشەییەتی - بەخت نەکات، ئەو سەروەت و سامانە بێ بەرەکەت و شوومەی دەستگیر نابێت.

پاشان ئەو ئازارەش کە لە ڕووی هەست و سۆزی مرۆڤێتییەوە کەسانی خاوەن ویژدان دەیچێژن، کاتێ بێ نەوا و هەژاران دەبینن بەدەم ئازارەوە دەتلێنەوە، لەم سەردەمەدا کە هەژاری و نەبوونی باڵی بەسەر خەڵکیدا کێشاوە، ئەم ئازارە بێ هیچ گومانێك، ئاوێتەی ئەو چێژ و لەزەتەیان دەبێت کە

بە پارە و سامانی ناڕەوا پەیدای دەکەن، بگرە لەزەتەکەیان پتر لێ تاڵ دەبێت، ئەگەر خاوەنی ویژدانی زیندوو بن.

لەم ڕۆژگار و سەردەمە سەیرەدا، تەنها لە سنووری ناچاریدا دروستە دەست بۆ سامانە گومان لێکراوەکان ببرێت، چونکە بەپێی قاعیدەی: "الضرورةُ تُقدَّرُ بقدرها" دەکرێت هەتا سنووری "زەرووڕەت" - نەك زیاتر - بە ناچاری لە ماڵی حەرام هەڵبگیرێت و، مرۆڤی "ناچار" بۆی نییە هەتا تێر دەبێت لە گۆشتی مردارەوەبوو بخوات، بەڵکو تەنها هێندەی بۆ دروستە لێی بخوات کە لە مردن بیپارێزێت. هەروەها نابێ لە بەردەم سەد کەسی برسیدا بە هەڵپەوە پەلاماری خواردن بدات!

لێرەدا ڕووداوێکی ڕاستەقینە دەگێڕمەوە کە بەڵگەی ئەوەیە "دەستپێوەگرتن" هۆی عیززەت و مایەی کەماڵە:

"حاتەمی تەی" کە بە سەخاوەت و بەخشندەیی بەناوبانگە، ڕۆژێکیان میوانداری‌یەکی گەورە ساز دەکات و، گەلێ دیاریی بەنرخیش بە میوانەکانی دەبەخشێت و، پاشان بەرەو دەشت و دەر دەڕوات. هەتا لەو بیابانەدا دەبینێت پیاوێکی پیری هەژار کۆڵێکی قورسی دار و گژوگیا و دڕك و داڵی لە کۆڵ ناوە و هەندێ شوێنی جەستەشی خوێنی لێ دەتکێت..

حاتەم پێی وت:

- مامە پیرە! ئەمڕۆ حاتەمی تەی میوانداری‌یەکی شکۆداری سازداوە و، دیاریی بەنرخیش دەبەخشێتەوە. زوو بڕۆ فریای بکەوە، بەشکو چەندین ئەوەندەی کۆڵە قورسەکەت سەروەت و سامانت دەست بکەوێت!

مامە پیرەی ژیر و دەستپێوەگر پێی وت:

- من بە عیززەتی دڵ و دەروون و، ڕەنج و ئارەقی ناوچاوانی خۆم دەژیم و، کۆڵ هەڵدەگرم و، ڕازی نابم ژێرباری منەتی حاتەمی تەی بکەوم!

جا ڕۆژێك لە حاتەمیان پرسی:

- کێت دیوە لە خۆت مەرد و بەڕێزتر بێت؟

وتی:

- ئەو مەردە پیرە دەستپێوەگرەی کە ڕۆژێك لە بیاباندا تووشی بووم. بە ڕاستی لە من گەلێ مەرد و بەڕێزتر بوو[1]!

☐ سەرنجی پێنجەم:

یەکێك لە خواستەکانی کەماڵی بەخشندەیی و کەرەمی خواوەند ئەوەیە کە لەزەتی نیعمەتەکانی خۆی بە هەژارترین کەس دەچێژێت، کتومت وەك ئەوەی کە بە دەوڵەمەندترین کەسی دەچێژێت. ئەوەتا هەژاریش بە وێنەی پادشا تامیان دەکات!

بەڵێ، ئەو لەزەتەی کە بەهۆی برسێتی و دەستپێوەگرتنەوە کەسێکی هەژار لە خواردنی لەتە نانێکی وشکی سووتاو دەیچێژێت، زۆر لەو تام و لەزەتە زیاترە کە پادشا یاخود مرۆڤی دەوڵەمەند لە خواردنی شیرینیەکی نایاب وەری دەگرێت کاتێ بە بێزاری و ئیشتیها لێ نەبوونی ئەنجامی "ئیسراف"ەوە دەیخوات!

بە ڕاستی گەلێ جێی سەرسووڕمانە کە هەندێ لە هەڵەخەرجان کەسانی "دەستپێوەگر" بە "نزمی" تاوانبار دەکەن! نەخێر، هەرگیز وا نییە، بەڵکو دەستپێوەگرتن عیززەت و کەرەمی ڕاستەقینە و تەواوەتییە و، نزمی و زەلیلیش لە ناوەڕۆك و دووتوێی ئەو سەخاوەتە ڕواڵەتییەدان کە هەڵەخەرجان دەینوێنن.

ساڵی دانانی ئەم پەیامە، لە ژوورەکەی خۆم لە شاری "ئیسپارتە"دا، بەسەرهاتێك ڕووی دا، پشتی ئەم ڕاستییە دەگرێت:

---

(١) ئەم بەسەرهاتە لە گولستانی شێخی سەعدی دا هاتووە. بڕوانە: (کلیات سعدی، به اهتمام محمد علی فروغی، ص ١٠٥ انتشارات امیر کبیر. تهران ١٣٦٩ هـ. ش. (وەرگێڕ)

یەکێ لە قوتابیی‌یەکانم گەلێ ڕووی لێنام کە دەستووری ژیانم[١] بۆ ئەو بشکێنم و، جەختی لێ کردم دیاری‌یەکەی وەربگرم کە بڕی دوو هۆقە و نیو هەنگوین بوو[٢].

هەرچەند هەوڵم دا بۆی ڕوون بکەمەوە کە دەبێ دەست لەو یاسایەی ژیانم هەڵنەگرم، بێ سوود بوو، قەناعەتی نەکرد. منیش بە ناچاری و، بەو نیازەی سێ کەسی تێدا بەشدار بکەم کە لەو ژوورە لەگەڵمدا بوون، تاکو بۆ ماوەی چل ڕۆژی شەعبان و ڕەمەزان بە دەستپێوەگرتنەوە لێی بخۆن و، خاوەنە بەخشەرەکەشی پاداشتی دەست بکەوێت و، ئەمانیش لەو ماوەیەدا بێ شیرینی نەمێننەوە، وەسیێتم بۆ کردن وەری بگرن. ئنجا من بۆخۆیشم یەك هۆقە هەنگوینم هەبوو..

جا هەرچەند ئەو سێ هاوڕێیەم لەسەر "ئیستیقامەت" بوون و، بە ڕاستی ڕێزی دەستپێوەگرتنیان دەزانی، بەڵام - بە هەر حاڵ - لە ئەنجامی ڕێزنان لە یەکتری و چاودێریی هەست و نەستی یەکتر و "إیثار"ی نێوانیان و چەند ڕەوشتێکی تری باش، ئەو ڕاستی‌یە ناوبراوەیان لە یاد چووەوە و، لە ماوەی تەنها سێ شەودا هەموو هەنگوینەکەیان تەواو کرد!

بە زەردەخەنەوە پێم وتن:

من نیازم وابوو سی ڕۆژ، یان زیاتر، ئێوە تامی هەنگوین بچێژن. بەڵام وا لە تەنها سێ ڕۆژدا تەواوتان کرد.. نۆشی گیانتان بێت!

کەچی هەنگوینەکەی خۆم بە دەستپێوەگرتنەوە بەشی هەردوو مانگی شەعبان و ڕەمەزانی کردم و، جگە لەوەش - سوپاس بۆ خوا - بوو بە مایەی

---

(١) مەبەست لەو دەستوورەی ژیانی ئەوەیە کە: بە خۆڕایی هیچ دیاری و شتێکی لە کەس وەرنەگرتووە. (وەرگێڕ)

(٢) هەریەك لەو هۆقانە یەکسانە بە ١٢٨٠ گرام. (وەرگێڕ)

دەستکەوتنی پاداشتێکی زۆر بۆم، چونکە هەریەك لەو برایانە لە دەمی بەربانگدا کەوچکێکم دەدانێ[١].

جا لەوانەیە کەسانێك کە ئەو حاڵەی منیان بینیبێت بە "نزمی" لە قەڵەمیان دابێت و، حاڵەتی سێ شەوەکەی ئەو برایانەش بە "عیززەت" و "کەرەم" دابنێت!

بەڵام ئێمە لە ڕووی حەقیقەتەوە بینیمان کە لە ژێر پەردەی ئەو نزمی‌یە ڕواڵەتی‌یەدا عیززەتێکی بەرز و بەرەکەتێکی فراوان و پاداشتێکی زۆر حەشار دراون.. هەروەك لە ژێر پەردەی ئەو کەرەم و ئیسرافەشدا - ئەگەر وازی لێ نەهێنرابێت - سوالکردن و چاوتێبڕین و تەماع بۆ شتی ناو دەستی خەڵکی و، حاڵەتەکانی تری هاوچەشنیان، کە گەلێ لەو "نزمی"یە نزمترن، شارراونەتەوە!

❑ سەرنجی شەشەم:

مەودا و جیاوازی‌یەکی گەورە و فراوان لە نێوان "دەستپێوەگرتن" و "نزمی"دا هەیە. چونکە:

هەروەك "تەوازوع" کە ڕەفتارێکی باش و شیرینە، گەلێ جیایە لە "زەلیلی" کە ڕەفتارێکی هەڵە و خراپە، هەرچەندەش بە شێوە لە یەك دەچن..

هەروەها وەك "ویقار" کە ڕەوشتێکی پەسەند و چاکە، لە واتا و کاکڵەیدا جیاوازە لە "تەکەببور" کە ڕەوشت و خوویەکی گەلێ بێ کەڵکە، هەرچەند لە ڕواڵەتیشدا وەکو یەك دەردەکەون..

هەروەك ئەمانە بەو جۆرەن، "دەستپێوەگرتن"یش کە یەکێکە لە خولق و خووە بەرزەکانی پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو یەکێکە لە تەوەرەکانی هەڵسووڕانی ڕێسای دانستی زاڵ و فەرمانڕەوای خوای گەورە لە گەردووندا، بە هەمان

---

(١) مەبەست کەوچکەچای گەورەیە (هی کووب). (دانەر)

جۆرە و، هەرگیز پەیوەندیی بە "نزمی"یەوە نییە کە ئاوێتەیە کە لە سووکی و زەلیلی و چاوچنۆکی و هەڵپەکاری. تەنانەت هەر هیچ پەیوەندییەکیان لە نێواندا نییە.

وا ئەم ڕووداوەتان بۆ دەگێڕمەوە کە پشتی ئەو ڕاستییە دەگرێت:

"عەبدوڵڵا"ی کوڕی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب - خوایان لێ ڕازی بێت - کە کوڕە گەورەی فاروقی ئەعزەمی جێنشینی پێغەمبەرە ﷺ و، یەکێکە لە حەوت "عەبدوڵڵا" ناوەکان و، زانایەکی بەناوبانگ و مەزنی نێوان هاوەڵە بەڕێزەکانە، ڕۆژێکیان لەناو بازاڕدا و بۆ مەبەستی پارێزگاری لە "دەستپێوەگرتن" و "قەناعەت" و "ئیستیقامەت" کە تەوەرەی کەسابەت و بازرگانین، لە مامەڵەی شتێکدا کە قورشێکی نەدەهێنا، کەوتە مشتومڕێکی سەختەوە.

لەم کاتەدا هاوەڵێکی تر ئەمەی لێ بینی، وا گومانی برد کە ئەم ڕەفتارە "نزمی" بێت و، بە هەڵەیەکی گەورەی "عەبدوڵڵا"ی ژمارد. چونکە کوڕی میری موسڵمانان و خەلیفەی سەرزەوی چۆن دەبێ ڕەفتاری بەو جۆرەی لێ بووەشێتەوە؟

پاشان دوور و نزیک شوێن "عەبدوڵڵا" کەوت کە بەرەو ماڵەوە دەگەڕایەوە، تاکو شتێك لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی تێبگات. سەرنجی دا لە بەردەرگا لەگەڵ هەژارێکدا ماوەیەك ڕاوەستا و بە نەرمونیانی و سۆز و خۆشەویستییەوە لەگەڵیدا دوا. پاشان لە دەرگای دووهەم هاتە دەرەوە و بە هەمان شێوە لەگەڵ هەژارێکی تردا کەوتە گفتوگۆ!

ئەم کارە، سەرنجی تاسەی ئەو هاوەڵەی بزواند تاکو بزانێت "عەبدوڵڵا" چیی لەگەڵ ئەوانەدا کردووە. لەبەر ئەوە، بە پەلە خۆی گەیاندە هەژارەکان و لێی پرسین:

- ئایا پێم نالێن "عەبدوڵڵا" کە ڕاوەستا چیی لەگەڵ کردن؟

هەریەکەیان وتیان:

- پارچەیەك زێڕی پێ بەخشیم!

هاوەڵە بەڕێزەکە لە سەرسووڕماندا وتی: "سبحان الله.. ئەم کارە چەندە سەیرە! لەو لاوە لەسەر یەك قورش لە بازاڕدا دەکەوێتە مشتومڕەوە و، کەچی لەم لاشەوە لە ماڵی خۆیدا و بە ڕەزامەندیی خۆی و بێ ئەوەی کەس پێی بزانێت، سەدان ئەوەندە بەم هەژارانە دەبەخشێت"!

پاشان ڕۆشت بۆ لای "عەبدوڵلا"ی کوڕی حەزرەتی عومەر و لێی پرسی:

- ئەی ئیمام! ئەم گیروگرفتەم بۆ شی بکەرەوە: تۆ لە بازاڕدا بەو جۆرە ڕەفتارت کرد و، لە ماڵیشەوە ئاوا و ئاوا؟!

وەڵامی دایەوە و وتی:

- ئەوەی لە بازاڕدا ڕووی دا ئەنجامی دەستپێوەگرتن و ژیری بوو، بۆیە لەوێدا وا ڕەفتارم کرد تاکو پارێزگاری لە ئەمانەت و ڕاستگۆیی بکەم کە بناغە و گیانی مامەڵە و کڕین و فرۆشتن و بازرگانین، ئەم کارە هەرگیز بە نزمی و ڕەزیلی دانانرێت. ئنجا ئەو ڕەفتارەش کە لە ماڵەوە بینیت لە سەرچاوەی دڵنەرمی و پلەی بەرز و کامڵیی ڕۆحەوە هەڵقوڵاوە. کەواتە نە ئەو نزمی‌یە و، نە ئەمیش ئیسرافە!

ئیمامی ئەعزەمیش - ئەبوو حەنیفەی نوعمان - خوای لێ ڕازی بێت، ئاماژەی بۆ ئەم نهێنی‌یە کردووە کاتێ فەرموویەتی: "لا إسرافَ في الخير، كما لا خيرَ في الإسراف"! واتە: هەروەك کردەوەی "خێر" و چاکەکاری هەتا زیاتر بێت کارێکی باشە و بە ئیسراف دانانرێت، بە هەمان جۆر "ئیسراف"یش هەرگیز بە کارێکی باش دانانرێت و هیچ خێرێکی تێدا نی‌یە.

☐ سەرنجی حەوتەم:

"ئیسراف" هەڵپەکاری بەرهەم دەهێنێت و، "هەڵپە"ش سێ ئەنجامی لێ دەبێتەوە:

*یەکەمیان*: قەناعەت نەکردنە.

جا لەبەر ئەوەی نەبوونی قەناعەت، مرۆڤی هەڵپەکار فێری "سکاڵا" دەکات لە بریی "شوکرانە"، ئەوا شەوقی مرۆڤ لە کار و کۆشش دوور دەخاتەوە و، دەیهاوێتە باوەشی تەمبەڵییەوە و، هانی دەدات کە واز لە ماڵ و سامانی هەرزان و دەستکەوتی حەڵاڵ بهێنێت[1] و، بۆ ئەو ماڵ و سامانە ناڕەوایانە بگەڕێت کە ئەرك و ماندووبوونی تێدا شك نابات. بەم جۆرە و لەم پێناوەدا عیززەت و ڕێزی خۆی دەدۆڕێنێت.

*ئەنجامی دووەمی هەڵپەکردن*: نائومێدی و زەرەرمەندییە!

چونکە بە هەڵپەکردن ئامانجی مرۆڤە هەڵپەکارەکە لە کیس دەچێت و، ڕەزای لای خەڵکی قورس دەبێت و، لە یارمەتی و هاوکاریی کەسانی تریش بێ بەش دەبێت. هەتا وای لێ دێت کە ناوەرۆکی ئەم وتە بەناوبانگەی تێدا بەرجەستە ببێت کە دەڵێت: "الحريصُ خائبٌ خاسر"!

کاریگەری و ئەنجامی "هەڵپە" و "قەناعەت" بەپێی دەستوورێکی گشتی و هەمەلایەنگر و بەردەوام، لە جیهانی زیندەوەراندا دەست بەکارە.

بۆ نموونە:

○ "ڕووەکەکان" کە موحتاج و ناچاری ڕۆزین و بە دوایشیدا ناگەڕێن، بە هۆی ئەو قەناعەتە سروشتییەی کە هەیانە، ڕۆزییەکانیان دێن بۆ لایان! بەڵام "گیاندارە ئاژەڵەکان" کە بە هەڵپەوە بە دوای ڕۆزییەکەیاندا دەگەڕێن، زۆر بە زەحمەت و کەمی دەستگیریان دەبێت!

---

(١) چونکە بەهۆی دووری لە "دەستپێوەگرتن"ەوە گرۆی بەکاربەران(المستهلكون) زۆر دەبن و بەرهەم هێنەرانیش کەم دەبنەوە و، هەموان چاو دەبڕنە دەرگای حکومەت! ئەو کاتەش یەك بە یەکی کەناڵەکانی: پیشەسازی و بازرگانی و کشتوکاڵ، کە تەوەرەی ژیانی کۆمەڵایەتین، کەمی و نوشستی دەهێنن و، کۆمەڵیش لە ئەنجامدا نزم دەبێتەوە و هەرەس دەهێنێت و، سەری لە نەبوونی و هەژارییەوە دەردەچێت! (دانەر)

ئەم دوو دیاردەیەش ڕادەی زیانی گەورەی "هەڵپە" و، مەودای سوودی مەزنی "قەناعەت"مان بۆ دەردەخەن..

○ هەروەها منداڵە لاواز و ساواکان، بە گشتی و بێ ئەوەی خۆیان هیچ حسابێکیان بۆ ڕۆزی کردبێت و بزانن لە کوێوە دێت، لە ئەنجامی ئەو قەناعەتەی کە زمانی حاڵیان دەری دەبڕێت، خۆراکێکی پوخت و نیانی - وەك شیر - لە دەمیاندا ڕۆ دەکرێت. کەچی ئاژەڵە گەورەکان بە هەڵپە و چاوچنۆکی‌یەوە هەڵمەت بۆ ڕۆزی‌یە کەم و چەپەڵەکەیان دەبەن!

هەموو ئەمانە، ئەو دەعوایەمان دەچەسپێنن..

○ هەروەها حاڵی ماسی‌یە دەبەنگ و قەڵەوەکان، کە دارای قەناعەتێکی ئەوتۆن ڕۆزی‌یەکانیان بە دەست بگەیەنێت و، دەستەوسانیی ئاژەڵە زیرەکەکانی وەك ڕێوی و مەیموونیش لە بەدەستهێنانی تەواوەتیی ڕۆزی‌یەکەیان و مانەوەیان بە لاوازی، هەرچەندەش گەلێ هەڵپە و هەناسەبڕکێی بە دوادا دەکەن..

هەموو ئەمانە، ڕادەی ئەو ماندوویی و سەختی‌یە ئاشکرا دەکەن کە "هەڵپەکاری" بەرهەمی دەهێنێت و، مەودای ئەو حەوانەوە و خۆشگوزەرانی‌یەش دەردەخەن کە ئەنجامی "قەناعەتکاری"ن..

○ هەروەها کە جولەکەکان بەهۆی هەڵپەکاری و مامەڵەکردنیان بە "سوو" و، بەکارهێنانی ساختە و فرتوفێڵ، هەمیشە ئەو ڕۆزی‌یە کەمەی مایەی بژێویان بێت لە ڕێگا نامەشرووعەکانەوە و هاودەم لەگەڵ زەلیلی و سووکیدا بەدەست دەهێنن. بەڵام ئەو گوندنشینانەی کە خاوەنی قەناعەتن، هەمیشە ڕۆزیی مایەی بژێویان و ژیانی سەربەرزی و مەردانەیان بە ئاسانی دەست دەکەوێت.

ئەمەش وەك نموونەکانی تر پشتی ئەم دەعوایەمان دەگرێت!

○ هەروەها دەبینین ئەو هەلپەیەی کە زانایان[١] و ئەدیبان[٢] لە ڕێی زیرەکی و بلیمەتی یەوە بەکاری دەهێنن، گرفتاری هەژاری یان دەکات و تەنها گوزەرانی مایەی بژێویان بۆ فەراهەم دەهێنێت، کەچی لەو لاشەوە دەوڵەمەندیی زۆربەی کەسانی دەبەنگ و دەستەوسان دەبینین کە بەهۆی حاڵەتی سروشتیی قەناعەت بەخشیانەوە دەستیان کەوتووە!

هەموو ئەم نموونانەی باسمان کردن، بە تەواوی و بێ گومانی دەیچەسپێنن کە:

ڕۆزیی "حەڵاڵ" بە ئەندازەی هەژاری و ڕادەی دەستەوسانی بە مرۆڤ دەبەخشرێن، نەك بەپێی توانا و ئیختیار! تەنانەت هاتنی ڕۆزی هەمیشە پێچەوانەی توانا و ئیختیارە، نابینیت منالان هەتا ویست و توانا و ئیختیاریان زیاد بکات، ڕۆزی یەکانیان کەم دەبنەوە و بە زەحمەت دەستیان دەکەوێت؟!

بەڵێ، "قەناعەت" گەنجینەیەکە بۆ خۆشگوزەرانی و، مایەی حەوانەوەی ژیانە. بەڵام "هەڵپەکردن" کانگای نزمی و زەرەرمەندی یە، وەك لەم فەرموودە پیرۆزەدا دەردەکەوێت: "القناعةُ كنـزٌ لا يفنى"[٣].

---

(١) نەوشیروانی پادشای دادپەروەری ئێران لە بوزەرجەمهەری زانای پرسی: بۆچی زانایان لە دەرگای میرەکاندا دەبینرێن، بەڵام میران لە دەرگای زانایاندا نابینرێن، لە کاتێکدا کە زانست لە ئەمیری بەرزترە؟!

وەڵامی دایەوە: ئەوە نیشانەی زانایی زانایان و نەزانیی میرەکانە!

واتە: میران نرخی زانست نازانن، بۆیە ناڕۆنە دەرگای زانایان بۆ دەسخستنی زانست، بەڵام زانایان بەهای دەزانن بۆیە لە دەرگای میرەکاندا داوای نرخەکەی دەکەن!

دیارە ئەم وەڵامە وردە تەئویلێکی ژیرانەیە بۆ پاساودانی هەڵپەی زانایان کە هی زیرەکییانە و، لە ئەنجامیشدا دەیانگەیەنێتە زەلیلی و هەژاری. (خەسرەو).

(٢) ئەو دیاردەیەی کە پشتی ئەم فەرمانە دەگرێت، ئەوەیە کە ئەدیبان لە فەرەنسادا بروانامەی "سوالکەری"یان دەدرێتێ، چونکە بە باشی تیایدا شارەزان! (سلێمان ڕوشدی).

(٣) حديث: "القناعة مال لاينفد وكنـز لايفنى" رواه الطبراني في الأوسط والعسكري عن جابر. والمشهور: "القناعة كنـز لا يفنى". (وەرگێڕ)

*ئەنجامی سێهەم:* هەڵپەکردن ئیخلاس دەفەوتێنێت و کاری دوارۆژ دەشێوێنێت.

چونکە ئەگەر ئیمانداری خاوەن تەقوا گرفتاری "هەڵپەکاری" بێت، ئەوا لە دەروونەوە حەز دەکات خەڵکی ڕووی تێبکەن. خۆ دیارە هەر کەسێك ئەم ئارەزووەی تێدا سەر هەڵبدات و چاوەڕوانی بێت، هەرگیز بە پلەی ئیخلاسی تەواوەتی ناگات و ناتوانێت بەدەستی بهێنێت. ئەم ئەنجامە گەلێ گرنگە و شایانی تێبینی و سەرنجدانە.

**پوختەی ئەمانەی پێشوو:**

"ئیسراف" هەمیشە بێ قەناعەتی (واتە تەماع) بەرهەم دەهێنێت، تەماعیش چوست و چالاکیی شەوقی کارکردن کز دەکات و، مرۆڤ دەهاوێتە ئامێزی تەمبەڵی و کەمتەرخەمییەوە و، دەرگای سکاڵا و پەژارەی لە ژیاندا لێ دەخاتە سەرپشت، تا دەیگەیەنێتە ئەو ڕادەیەی کە هەمیشە لە ژێر ئازاری سکاڵا و بێزاریدا[1] بناڵێنێت. هەروەك ئیخلاسەکەشی تێکدەدات و، دەرگایەکی بۆ ڕیاکاری لێ دەخاتە سەر پشت و، لەم ڕێیەوە عیززەتەکەی دەشکێنێت و، ڕێی سواڵ و سووکایەتی و ڕسوایی پیشان دەدات.

بەڵام "دەستپێوەگرتن" هەمیشە بەری قەناعەت دەگرێت و، قەناعەتیش عیززەت بەرهەم دەهێنێت، بەپێی فەرمایشتی: "عزَّ من قنع ذلَّ من طمع".

هەروەك لە ڕێی کار و کۆششەوە شەوقی مرۆڤیش تیژ دەکاتەوە و، بەرەو هەوڵ و تێکۆشان لە کار و کۆششدا دەیداتە بەر. چونکە مرۆڤ ئەگەر یەك ڕۆژ کاری کرد و ئێوارەکەی کرێی خۆی وەرگرت، ڕۆژی دووهەمیش

---

(١) بەڵێ، ئەگەر کەسێکی هەڵەخەرج بدوێنیت، بێهیچ گومانێك سکاڵای زۆر و زەبەندەی لێ دەبیستیت، دەبینیت هەرچەندەش دەوڵەمەند بێت، زمانی هەر سکاڵا دەردەبڕێت. بەڵام گەر هەژارێکی قەناعەتکار بدوێنیت، جگە لە شوکر و سوپاسگوزاریی خوای گەورە هیچی تری لێ نابیستیت. (دانەر)

هەوڵی کارکردن دەداتەوە. بەڵام مرۆڤی هەڵەخەرجی ئیسرافکار، لەبەر نەبوونی قەناعەت، ڕۆژی دووهەم ئەو هەوڵە نادات، خۆ ئەگەر هەوڵیش بدات ئەوا بێ هیچ شەوق و حەزێك دەیدات.

بەم جۆرە، دەرکەوت کە ئەو قەناعەتەی ئاکامی "دەستپێوەگرتن"ە، دەرگای شوکرانەبژێری لە مرۆڤ دەخاتە سەرپشت و هی سکاڵایشی لێ دادەخات و، لە سەرانسەری ژیانیدا دەیخاتە شوکرانەی بەردەوامەوە. ئنجا بەهۆی قەناعەتیشەوە ئاوڕ لەوە ناداتەوە کە خەڵکی بۆی بڕوانن و پلە و پایەی بۆ دابنێن، چونکە هەست دەکات پێویستی پێیان نییە و دەوڵەمەندە بەرامبەریان. بەوەش دەرگای "ئیخلاس"ی لێ دەکرێتەوە و هی "ڕیاکاری"شی لێ دادەخرێت.

بە چاوی خۆم ئەو زیانە گەورانەم بە فراوانی و بەرجەستەیی بینی کە دەرەنجامی ئیسراف و گوێ نەدانن بە "دەستپێوەگرتن"..

وا لە خوارەوەدا بۆتان باس دەکەم:

نۆ ساڵ پێش ئێستا هاتم بۆ شارێکی بەپیت و بەرەکەت و، وەرزیش زستان بوو، نەمتوانی سەرچاوەی سەروەت و لایەنەکانی بەروبوومی ئەو شارە ببینم.

موفتیی شار - خوا لێی خۆش بێت - پێی وتم:

"خەڵکی شارەکەمان دەستکورت و هەژارن". چەند جارێکیش قسەکەی دووپات کردەوە. ئەم هەواڵە گەلێ کاری تێکردم و سۆزی بزواندم و، تاکو نزیکەی شەش ساڵ خەم و ئازارم بۆ دەچەشتن و، دوعای میهرەبانیم بۆ دەکردن.

کە پاش هەشت ساڵ لە وەرزی هاویندا سەرم لەو شارە دایەوە و سەیری باخ و بێستانەکانیم کرد، قسەکەی موفتیی خوا لێخۆشبووم هاتەوە یاد. بە سەرسوورمانەوە وتم:

سبحان الله! خۆ داهات و بەروبوومی باخ و بێستانەکانی ئەم شارە زۆر لە پێداویستییەکانی هەموو خەڵکی شار زیاترن، دەبوو دانیشتووانی ئێرە گەلێ دەوڵەمەند بوونایە!! ماوەیەك لەم سەرسووڕمانەدا بووم.

پاشان لە ڕێی "ڕاستی"یەکەوە (کە ڕواڵەت نەیتوانی بمخەڵەتێنێت و ئەو ڕاستییەم لێ بشارێتەوە، چونکە حەقیقەتێکە هەمیشە بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکان دەیکەم بە ڕابەر و ڕێنمای خۆم) تێگەیشتم کە:

لە ئەنجامی ئیسراف و دەست پێوەنەگرتنەوە بەرەکەت لەم شارە هەڵگیراوە! بۆیە موفتی - خوا لێی خۆش بێت - وتی: "خەڵکی شارەکەمان دەستکورت و هەژارن". سەرباری ئەم هەموو سەرچاوە زۆرەی سەروەت و گەنجینەی داهاتیش کە لە شارەکەیاندا هەیە.

بەڵێ، بە تاقیکردنەوە و لێکدانەوەی چەندین ڕووداوی لە ژمارەبەدەر چەسپاوە کە زەکات دەرکردن و بایەخدان بە هۆکارەکانی دەستپێوەگرتن، هۆی پیت و بەرەکەت و زیاد بوونی ڕۆزین. بەڵام ئیسراف و زەکات نەدان، بەرەکەت هەڵدەگرن.

"ئیبن سینا" کە ئەفلاتوونی فەیلەسووفە موسڵمانەکان و، ڕابەری پزیشکان و، مامۆستای فەیلەسووفەکانە، لە گۆشەنیگای پزیشکییەوە تەفسیری ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا﴾ی بەم دێڕە شیعرانەی خوارەوە کردووە کە دەڵێت:

جمعتُ الطبَّ في بيتين جمعـاً ... وحُسن القول في قِصَر الكلام

فقلِّلْ إنْ أكلتَ، وبعـد أكلٍ ... تجنَّبْ، والشِّفاءُ في الانـهضام

وليس على النفوسِ أشدُّ حالاً ... من ادخال الطعام على الطعام

واتە: زانستی پزیشکیم لە دوو دێڕی شیعردا کۆکردووتەوە، دیارە جوانترین وتەیش ئەو گوفتارەیە کە بە کورتی و پوختی واتا بە دەستەوە بدات:

کە خۆراکت خوارد کەم بخۆ. پاشان خۆت لە زیادەخۆری بپارێزە. چونکە شیفا لەوەدایە خۆراك هەرس بکرێت..

هیچ شتێك بۆ گەدە لەوە سەخت و قورستر نییە کە خواردنی بەسەر خواردندا بۆ ڕەوانە بکرێت[1].

﴿سبحانك لا علمَ لنا إِلاّ ما علّمْتنا إِنكَ أنتَ العليمُ الحكيم﴾.

* * *

تێبینی:

وا ئەم تەوافوق (یەك کەوتن)ە سەرسووڕهێنەر و عیززەت بەخشەتان بۆ باس دەکەم:

پێنج شەش کەسی جیا جیا - کە سیانیان بە تەواوی نووسین نازانن - پەیامی "دەستپێوەگرتن"یان نووسییەوە و، سەرنجمان دا: (هەموو پەنجا و یەك) ئەلفەکانی هەر یەك لەو نوسخانەی کە دوعایان تێدا نەنووسرابوو، هەروەها هەموو (پەنجا و سێ) ئەلفێکی ئەو نوسخانەش کە دوعایان تێدا نووسرابوو، وەکو یەك دەرچووبوون. هەرچەندەش جێگای ئەو نووسەرەوانە یەك جێگا نەبووە و جۆری دەستخەتیشیان وەکو یەك نەبوون و، هەرگیز بیریشیان لەو ئەلفانە نەکردبووەوە!

---

(١) واتە: زیانبەخشترین کار بۆ لەش ئەوەیە کە مۆڵەتی چوار پێنج سەعاتی بە ژەمەکانی خواردن پێ نەدرێت و، بە خواردنی یەك لە دوای یەك گەدە پڕ بکرێت. (دانەر)

جا یەککەوتن و وەکو یەك دەرچوونی ژمارەی ئەو پیتی ئەلفانە لەگەڵ مێژووی دانانی "پەیامی ئیقتیصاد" و پاکنووس کردن و لەبەر نووسینەوەیدا، کە بە مێژووی ڕۆمی پەنجا و یەك(١٣٥١)ە و، بە هی کۆچیش پەنجا و سێ(١٣٥٣)یە، بێ هیچ گومانێك ناکرێت بخرێتە ئەستۆی ڕێکەوتەوە. بەڵکو ئەم تەوافوقە ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە بەرەکەتی "دەستپێوەگرتن" تا پلەی کەرامەت بەرز بووەتەوە. بە ڕاستی شایانی خۆیەتی کە ئەم ساڵە ناوی: "ساڵی دەستپێوەگرتن"ی لێ بنرێت!

بەڵێ، هەر لە ڕاستیدا ڕۆژگار بە کردەوە ئەم بەرەکەتی دەستپێوەگرتنەی چەسپاند، کاتێك گرۆی مرۆڤ، دوای دوو ساڵ، جەنگی جیهانیی دووهەمی بە خۆیەوە بینی. ئەو جەنگەی کە برسێتی و وێرانی و هەموو جۆرە ڤێزەونەکانی ئیسرافی لە گشت لایەکی جیهاندا بڵاو کردەوە و، مرۆڤایەتیی ناچار کرد کە لە دەوری "دەستپێوەگرتن" کۆ ببنەوە و دەست لە داوێنی بەرنەدەن.

## هەڵپەکار نائومێد و زەرەرمەندە

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿إِنَّ اللهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو القُوَّةِ المَتِين﴾ (الذاريات:٥٨)

﴿وكأيِّنْ مِنْ دابَّةٍ لا تَحْمِلُ رِزْقَهَا اللهُ يَرْزُقُها وإِيَّاكُمْ وهُوَ السَّميعُ العَليمُ﴾(العنكبوت: ٦٠)

ئەی برای باوەڕدار!

لەمانەوە کە باسمان کردن، بۆت دەرکەوت کە "دوژمنایەتی" و "ڕقەبەرایەتی" چ زیانێکی گەورە بەجێ دەهێڵن. ئێستاش ئەوە بزانە کە هەڵپەکردن بۆ ژیانی دنیا(الحرص) دەردێکە وەك دوژمنایەتی وایە، بەڵکو ئەو زیانەی کە بەهۆی هەڵپەکردنەوە لە ژیانی ئیسلامی دەکەوێت گەلێ لە زیانی دوژمنایەتی زیاترە.

بەڵێ، هەڵپەکردن خۆی لە خۆیدا هۆی نائومێدی و ڕەجالیيەو، نەخۆشیيەکی سامناکەو، تابڵێی سەرشۆڕی و زەلیلیی لە دووتوێدایە. هەر هەڵپەکردنە کە بایەخی مرۆڤ دادەگرێت و، لەو شتەش نائومێد و بێ بەشی دەکات کە هەڵپەکەی بۆ بەکار دەهێنێت!

باشترین شایەت لەسەر ئەم دەرەنجامەی کە "هەڵپەکردن" بەرهەمی دەهێنێت و مرۆڤی پێوە گیرۆدە دەکات، ئەو زەلیلی و دەستکورتی و

ڕسواییەی جوولەكەكانە كە بە درێژایی مێژوو بەسەریاندا هات، چونكە ئەوان لە هەموو نەتەوەكانی تر زیاتر هەوڵی بێ وچانیان بۆ كۆكردنەوە و دەستخستنی كەرەسەی بێ نرخی دنیای فانی دەدا.

هەڵپەكردن بۆ ژیانی دنیا، هەر لە گەورەترین بازنەی جیهانی بوونەوەرانەوە تا دەگاتە بچووكترین دانە و تاك لەناو ئەواندا، شوێنەواری خراپی خۆی دەردەخات. بەڵام بە پێچەوانەی ئەمەوە، ئەو هەوڵەی كە هاودەم لەگەڵ "تەوەككول"دا بۆ ڕۆزیی حەڵاڵ دەدرێت، دەبێتە مایەی دڵنیایی و حەوانەوە و، لە هەموو جێگایەكیشدا شوێنەواری بەسوودی خۆی بەجێ دەهێڵێت.

بۆ نموونە:

"ڕووەك و درەخت" كە وەك هەر زیندەوەرێكی تر پێویستیان بە ڕۆزیی تایبەتیی خۆیان هەیە، هەرچەند لە جێگای خۆیاندا ڕاوەستاون و بە دوای ڕۆزیدا ناگەڕێن، كەچی - لەبەر ئەوەی قەناعەت و تەوەككولیان هەیە - ڕۆزییەكانیان بۆ دێت، بێ ئەوەی بە دوایدا بگەڕێن و هەڵپەی بۆ بكەن! تەنانەت لە زیندەوەرە گیاندارەكان زیاتر پەرە دەسێنن و بەروبووم پێشكەش دەكەن..

بەڵام "زیندەوەرانی تر" بە هەوڵ و ماندووبوونێكی زۆر نەبێت ڕۆزییان دەستگیر نابێت، ئەویش بە ئەندازەیەكی كەم و ناتەواو! هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە ئەو زیندەوەرانە بە هەڵپەوە هەوڵی بۆ دەدەن.

بەڵكو هەر لە خودی جیهانی زیندەوەراندا دەبینین كە بە لێشاو ڕۆزی بەسەر بێچووەكانیاندا دەبارێت و، لە گەنجینەی بەزەیی خواوەندەوە ڕۆزیی یەكجار پاك و بێگەردی خۆیان بۆ ڕەوانە دەكرێت. چونكە ئەو ساوا و بێچووانە بە زمانی حاڵی لاوازی و كۆڵەواری و دەستەوسانییان

تەوەککولیان لەسەر خوای خۆیان دەردەبڕن، کەچی زیندەوەرە دڕندەکان کە بە هەڵپەوە هێرش دەبەنە سەر نێچیرەکانیان، بە ماندووبوونێکی زۆر و هەوڵدانێکی گەورە نەبێ "ڕۆزی"یان دەستگیر نابێت!

ئەم دوو حاڵەتە، بە جوانی بۆمان ڕوون دەکەنەوە کە "هەڵپەکردن" دەبێت بەهۆی بێ بەش بوون، بەڵام "تەوەککول" و "قەناعەتکردن" دەبنە هۆی دەستکەوتنی بەخشش و میهرەبانی.

هەمان شت لە جیهانی "ئادەمیزاد"یشدا دەبینین. ئەوەتا جوولەکەکان کە لە هەموو کەس زیاتر لە هەڵپەدان بۆ ژیان (ئیتر هەر جۆرە ژیانێك بێت) و، فەزڵی ژیانی دنیا بەسەر هی قیامەتدا دەدەن، بەڵکو تا ڕادەی شەیدابوونیش دنیایان خۆش دەوێت و، لەم بوارەدا پێش هەموو نەتەوەیەکی تر کەوتوونەتەوە.. ئەم جوولەکانە، هەر لە دێر زەمانەوە لەسەر دەستی نەتەوەکانی تردا چەندین کوشتاریان لێ کراوە و، چەندان جاریش زەلیلی و ڕسواییان دەرخوارد دراوە. هەموو ئەمانەیان بەسەردا هاتووە لە بەرامبەر ئەوەی کە سەروەت و سامانێکی چەپەڵ و حەرامیان لە ڕێی سوو(الربا)ەوە دەستگیر ببێت و بە هەوڵێکی سەرومڕی زۆر پەیدای بکەن. کە بەم جۆرەش کۆیان دەکردەوە، بەشێکی کەم نەبێت هیچیان لێ کار نەدەکرد. وەك بڵێی کار و کاسبی و پیشەیان تەنها هەر کۆکردنەوە بێت!

ئەم حاڵەتە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە هەڵپەکردن کانگا و سەرچاوەی زەلیلی و زەرەرمەندی و بێ نرخییە.

چەندین ڕووداوی لەژمارەبەدەر هەن، هەموویان دەریدەخەن کە مرۆڤی هەڵپەکار هەمیشە لە زیانەوە نزیکە، بە ڕادەیەك کە وتەی: "الحريصُ خائبٌ خاسر"[١] بووە بە پەند و وەك حەقیقەتێك سەیر دەکرێت.

---

(١) واتە: مرۆڤی هەڵپەکار و بە تەماع، نائومێد و زەرەرمەندە. (وەرگێڕ)

جا مادەم ئەمە حەقیقەت و ئەنجامی هەڵپەکردنە و، تۆش ئەگەر بە ڕاستی حەزت لە دەستخستنی ماڵی دنیایە و دەتەوێت بە لێشاو دەستت بکەوێت، ئەوا بزانە کە بە هەڵپەکردن دەستگیر نابێت، بەڵکو لە ڕێگای تەوەککولەوە هەوڵی بۆ بدە با دەستت بکەوێت.

دەتوانین تەشبیهی هەڵپەکاران و قانیعان بەم نموونەیە بکەین:

جارێك دوو کەس دەڕۆنە میوانییەکی گەورە کە دەستەڵاتدارێکی مەزن سازی کردبوو.. یەکێك لەو دوانە پڕ بە دڵ ئاواتەخوازی ئەوەبوو کە جێی بێتەوە. لە دڵی خۆیدا دەیوت: خۆزگا هەر چۆن دەبوو خاوەنی دیوەخان جێی دەکردمەوە و لە سەرمای دەرەوە ڕزگاری دەکردم، من هەر ئەوەندەم بەسە. خۆ ئەگەر لە خوارووی خەڵکەکەشەوە جێگایەکم بداتێ، ئەوا مەردایەتیم لەگەڵدا دەکات.

بەڵام ئەوی تریان، بە پێچەوانەوە، چەند ڕەفتارێکی وای نواند کە ئەوە بگەیەنێت مافی بەسەر خاوەن ماڵەوە هەیێت و، پێی وابێت دەبێ ئەوان بە ناچاری خزمەتی بکەن و ڕێزی لێ بگرن! بەم جۆرە، لە خۆی بایی بوو و، لە دڵەوە دەیوت: "دەبێ خاوەنی دیوەخان بەڕێزترین و باشترین جێگام بۆ دابین بکات". پاشان بە هەڵپە و تەماعەوە ڕۆشتە ناو دیوەخان و چاوی بۆ شوێنی باش و لای سەرووی مەجلیس دەگێڕا! خاوەنی دیوەخانیش کە ئەم ڕەفتارەی لێ بینی، خوارترین جێی لە مەجلیسەکەدا پیشان دا کە تیایدا دابنیشێت! جا لەو کاتەدا کە دەبوو سوپاسی پێشکەش بکردایە، کەچی بە پێچەوانەوە، ڕەخنەی لە خاوەنی دیوەخان گرت و، ڕەزای خۆی لە بەرچاوی دانیشتواندا قورس کرد.

بەڵام میوانی یەکەمیان، بە خۆنەویستییەوە ڕۆشتە ژوورەوە و، بە دوای جێگایەکی نزیکدا دەگەڕا. خاوەنی دیوەخانیش بەخێرهاتنی کرد و ڕێزی

لـێ گرت. کە ئەم تەوازوعەشی لـێ بینی، دڵی پێی کرایەوە و پێی خۆش بوو. لەبەر ئەوە، نزیکی خستەوە لە خۆی و جێگایەکی بەرزی پێ بەخشـی. ئـەم مرۆڤەش هەتا نزیکتر دەبووەوە، سوپاسی زیاتری لە ڕووی خاوەنی دیوەخانـدا دەنواند.

دنیاش بەم چەشنەیە، دیوەخانی میواندارییی خوای میهرەبانە.. سەر ڕووی زەوی سفرە و خوانی پڕ لە میهرەبانیی ئەو خواوەندەیە.. پلـەکانی نیعمـەت و ڕۆزییەکانی سەر ئەو سفرەیەش، وەکـو جێگـا جیاجیاکـانی نـاو مـەجلیس و ئەنجومەنی نموونەکەوان.

کاریگەری و ئەنجامی ناهەموارى "هەڵپەکردن" هەموو کەسێك دەتوانێت هەستی پێ بکات، تەنانەت لەو کاروبارانەشدا کە زۆر ورد و بچووکن.

بۆ نموونە:

هەموو کەسێك دەتوانێت لە دڵی خۆیدا هەست بە بێزاری لەو سواڵکەرە بکات کە بـە هەڵپـە و تەماعـەوە یەخـەی دەگرێـت و بـەگیری دەهێنێـت، هـەتا وای لـێ دێت هیچی ناداتێ و دەست بە ڕوویەوە دەنێت.. هـەر هـەمان کـەس بەزەیی بەو سواڵکەرەدا دێتەوە کە بە قەناعەت و بێدەنگییەوە سواڵ دەکات، ئەم بەزەییەش هانی دەدات کە خێری بداتێ و دەست بە ڕوویەوە نەنێت!

نموونەیەکی تر:

هەر شەوێك خەوت لـێ بزڕێـت و حەزیشـت لـە خـەو بێـت، گـەر بیر لـە خەوتن نەکەیتەوە، ئەوا هێـدی هێـدی خـەوت لـێ دەکەوێت.. کـەچی گـەر لەسەر نوستن سوور بیت و، بیێتە خولیای سەرت و بڵێیت: دەبێ کەی خەوم لـێ بکەوێت؟ ئەوا خەوەکەت بە جارێ لـێ دەزڕێت!

نموونەیەکی تر:

کاتێك کـە چاوەڕوانی کەسێك دەبیت و خەریکـە ئـارامت نـامێنێت و، زۆر سووریت لەسەر چاوپێکەوتنی، وردە وردە خەفەت سەرت تێدەکـات و،

لەبەر خۆتەوە دەڵێیت: "بۆچی نەهات؟ بۆچی دواکەوت؟!" هەتا لـە ئـەنجامی ئەم سووربوونەت لەسەر بینین و چاوپێکەوتنی، ئارامت لە لا هـەڵدەگیرێت و ئەو جێگایە جێدەهێڵیت. خۆ هەر کە تۆ ئەو شوێنەت بەجێهێشت، ئەو کەسە دێت و دەگاتە ئەوێ! بەڵام پاش ئەوەی کە مەبەسـت لـە هاتنەکـەی نـەما و لـە کیس چوو!

ئەو نهێنی و حیکمەتەی کە لەم چەشنە ڕووداوانەدا هەیە، ئەوەیە کە:

هەروەك "نان" لە ئـەنجامی چـەند کردارێکی یـەك لـە دوای یەکـەوە پەیدا دەبێت، کە لە کێڵگەو، سەرخەرمان و، ئـاش و، تـەنووردا بـەجێ دەهێـنرێن، شتانی تریش بـە هـەمان جۆرن.. واتـە دەبێ بە پلەپلـە و یـەك لـە دوای یـەك و بەپێی حیکمـەتی لەسـەرخۆیی بێنـە کایـەوە. بـەڵام مرۆڤی هەڵپەکار بەبۆنـەی هەڵپەکردنەوە چاودێریی ئەو پلە پلە بوون و یەك لە دوای یەك هاتنانە ناکـات، کە چەند هەنگاوێکی مەعنەوین و لە ڕێکخستنی شتاندا هەن. ئیتر یـان ئەوەیە بـاز دەدات و پاشـان دەکـەوێت! یـان ئەوەیە پلەیەك لـەو پلــە زۆرانــە بــەجێ دەهێڵێت و ناگاتە ئامانج و مەبەستەکەی!

دەسا ئەی ئەو برایانەی کە هێندە بۆ ژیانی دنیا بە پەرۆشن کە سـەریان لـێ تێکچووە و لە هەڵپەکردنیاندا بۆ دنیا ڕێگایان لـێ ون بووە!

بۆچی ئێوە لەبەر هەڵپەکردن بۆ ژیـانی دنیـا ئـاوا بـە زەلیلـی و سەرشۆڕی ڕازی دەبـن، لــە کـاتێکدا کـە ئـەم هــەموو گـیرو گرفت و زیانانەشـی لــە دووتوێدایە؟

بۆچی بەو چەشنە ڕوو لە هەموو مـاڵ و سـامان و سـەروەتێك دەکـەن، بێ ئەوەی گوێ بدەن بەوەی کە ئایا حەڵاڵە یان حەرام؟

بۆچی لـەو پێنـاوەدا چـەند کاروبـارێکی گـەورە و بەنرخی ئـەوتۆ بـەخت دەکەن کە ژیانی دواڕۆژتان داخوازیانە و لەسەری بەندە؟ تەنانەت واتـان لـێ

هاتووە کە لە پێناوی ئەم هەڵپەیەدا یەکێك لە پایە گەورەکانی ئیسلام (کە زەکاتە) واز لێ دەهێنن.

لە کاتێکدا کە زەکات دەرکردن دەرگایەکی گەورەی وایە دەبێتە مایەی پیت و بەرەکەت و دەوڵەمەندی بۆ هەموو کەسێك و، گیروگرفت و موسیبەتیشی لێ دوور دەخاتەوە؟

ئەوانەی کە زەکاتی ماڵیان دەرناکەن، بە بێ هیچ گومانێك، بە ئەندازەی ئەو زەکاتەی کە دەکەوێتە ئەستۆیان، سامان لەدەست دەدەن و لە شتی پڕوپووچ و بێ سووددا لە ناوی دەبەن. یان بەڵا و موسیبەتێکی وایان دێتەڕێ کە بە زۆر ئەو ئەندازەیان لە دەست دەردەهێنێت و لەناوی دەبات!

ساڵی پێنجەمی جەنگی یەکەمی جیهانی، لە خەونێکی ئەندێشەیی سەیر و خاوەن حەقیقەتدا، ئەم پرسیارەم لێ کرا:

(ئایا چ نهێنی‌یەك لەم هەژاری‌یەدا هەیە کە نەتەوەی ئیسلام گرفتاری بووە و، بۆچی زەرەر و زیانی ئاوا ڕووی کردووەتە ماڵ و سامانیان؟.. نهێنیی ئەو ئەشکەنجە و ئازارەش چی‌یە کە جەستەیان لە ژێریدا دەناڵێنێت)؟

هەر لەو خەونەدا وەڵامی ئەم پرسیارەم بەم جۆرە دایەوە:

(خوای گەورە لەو ماڵ و سامانەی پێی بەخشیوین، لە هەندێکیاندا یەك لە دە و، لە هەندێکی تریشیاندا یەك لە چلی بە فەرز لەسەر داناوین کە لەو ماڵە دەری بکەین و، بیدەین بەو کەسانەی کە خوای گەورە خۆی بۆی دەستنیشان کردووین، تاکو لە لایەکەوە خێری ئەو دوعایانەمان دەستگیر ببێت کە لە زاری هەژارانەوە دەردەچن و، لەلایەکی تریشەوە لە ڕق و کینە و حەسوودیی دەروونیان ڕزگارمان ببێت..

بەڵام ئێمە لەتاو هەڵپەکردنمان بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامانی دنیا، دەستمان نووقاند و زەکاتمان دەرنەکرد..

خوای گەورەش ئەو زەکاتەی بە ڕێژەی (سی لە چل) و (هەشت لە دە) لێ وەرگرتینەوە..

هەروەها خوای گەورە داوای لێ کردین کە لە پێناوی ئەودا تەنها یەك مانگ لە ساڵێکدا برسێتی بچێژین و بەڕۆژوو بین، کە ئەمەش نزیکەی حەفتا حیکمەت و سوودی بۆ ئێمە تێدایە..

بەڵام ئێمە لەبەر ئەوەی دەروونی خۆمان زۆر بەلاوە ئازیز بوو، بەزەییمان پێدا هاتەوە و، نەمانویست ئەو برسێتییە کاتییەی پێ بچێژین.

خوای گەورەش لە سزای ئەمەدا پێنج ساڵی ڕەبەقی یەك لە دوای یەك بە سزای جۆرە برسێتی و ڕۆژوویەك گیرۆدەی کردین کە نزیکەی حەفتا موسیبەتی بۆ ئێمە تێدا بوو..

هەروەها خوای گەورە داوای لێ کردین جۆرە فەرمان و تەعلیماتێکی نوورانی و، بەرز و، پەروەردگارییانە لە ماوەی یەك سەعاتی ئەو بیست و چوارسەعاتەی شەو و ڕۆژدا بەجێ بهێنین..

کەچی ئێمە لە بەجێهێنانی ئەو زیکر و دوعا و نوێژانەدا تەمبەڵیمان نواند و، ئەو سەعاتەشمان لەگەڵ سەعاتەکانی تردا لەدەست چوو.

خوای گەورەش لە کەفارەتی ئەو خراپکاری و کەمتەرخەمییانەماندا ناچاری بەجێهێنانی جۆرە پەرستش و نوێژێکی تایبەتیی کردین، کە بریتی بوو لە بەجێهێنانی تەعلیمات و، مەشق و، هێرش و، بگرەو بەردەی جەنگ لە ماوەی پێنج ساڵی ڕەبەقی یەك لە دوای یەکدا)!

بەڵێ، لەو خەونەدا وام وت..

پاشان کە بێدار بوومەوە، سەرنجم دا و گەیشتمە حەقیقەتێکی گرنگ کە لەو خەونەدا هەبوو. کە ئەمەی خوارەوەیە:

دوو "وشە" هەن سەرچاوەی هەموو نزمایەتی و دواکەوتنە ڕەوشتی‌یەکانی مرۆڤایەتین. هەر ئەم دوانەشن کە دەبنە سەرچاوەی بارودۆخە ئالۆز و شلەژاوەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ.

لە وتەی بیست و پێنجەمی کتێبی وتەکان (واتە پەیامی موعجیزاتی قورئانی)دا لە باسی ئەو بەراوردەی کە لە نێوان شارستانێتیی نوێ و فەرمانەکانی قورئانی پیرۆزدا ساز کراوە، ئەو دوو وشەیەمان چەسپاندووە و ڕوونمان کردوونەتەوە. دوو وشەکەش ئەمانەن:

وشەی یەکەم ئەوەیە کە دەڵێت:

"من خۆم تێر بم چش لە خەڵکی، با لە برساندا بمرن"!

وشەی دووهەمیش ئەوەیە کە دەڵێت:

"تۆ بیکە و، من دەیخۆم"!

دوو شتی تریش هەن، بەردەوامی و مانەوە بەم دوو وشەیە دەبەخشن کە بریتین لە:

بڵاوبوونەوەی "سوو"(الربا) و.. نەدانی "زەکات".

تاقانە چارەسەر و دەرمانی شیفابەخشی ئەم دوو نەخۆشی‌یە لەوەدایە کە "زەکات" بە شێوەیەکی گشتی لە کۆمەڵدا فەرز بکرێت و، "سوو"یش بە تەواوی لابرێت و حەرام بکرێت..

چونکە گرنگیی زەکات تەنها بۆ چەند کەس و کۆمەڵێکی دیاری کراو نی‌یە، بەڵکو زەکات پایەیەکی گرنگە لە بنیاتنانی بەختەوەری و شادمانیی تێکڕای مرۆڤایەتیدا. بەڵکو ستوونێکی ڕەسەنی ئەوتۆیە کە ژیانی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتیی پێ ڕاگیر دەکرێت..

ئەوەتا لەناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا دوو چین هەن کە پێیان دەوترێت: (چینی عەوام و چینی خەواص). زەکاتیش بەزەیی و چاکەکاریی چینی

خەواص بۆ عەوام و، ڕێز و ئیحتیرامی چینی عەوامیش بۆ خەواص دەستەبەر دەکات..

دەنا کوتەکی زوڵم و ستەمکاری و خۆسەپاندنی خەواصەکان بەسەر عەوامەکاندا دەبارێت و، ئەو ڕق و کینەیەش کە لە دەروونی عەوامەکاندا هەیە بەرامبەر دەوڵەمەندان، دەتەقێتەوە و دەردەپەڕێت. ئیتر ئەم دوو چینە هەر بەو جۆرە لە ململانێ و زۆرانێکی بەردەوام و ڕقەبەرایەتی‌یەکی دژواردا دەمێننەوە، تا وردە وردە وای لێ دێت بەرەنگاری یەکتری بینەوە و بەرامبەر یەکتر ڕابووەستن و لەسەر "دەسمایە" و "کار" دەست بدەنە یەخەی یەکتر، وەك ئەوەی لە ڕووسیادا ڕووی دا!

دەسا ئەی سەخاوەتمەندان و چاکەخوازان و خاوەن ویژدانان!

ئەگەر ئەو خێر و چاکە و دەستگرۆییانەی دەیانبەخشن، نییەتی زەکاتیان لێ نەهێنن، ئەوا سێ زیانتان لێ دەکەوێت، بەڵکو ئەوەش کە بەخشیوتانە بێ دەستکەوتنی هیچ خێر و قازانج و سوودێك لە دەستتان دەردەچێت. چونکە ئەگەر ئەو چاکەیەی دەیبەخشن، بە ناوی خوا و لە پێناوی خوادا نەبێت، ئەوا - بێ هیچ گومانێك - منەت و پیاوەتی بەسەر ئەوانەدا دەنوێنن کە پێیان دەبەخشن، هەرچەندەش بە ئاشکرا ئەم منەتە دەرنەبڕن. بەم کارەش ئەو هەژارە دەکەنە دیلی منەت و دەیبەستنەوە. پاشان لە نزا و دوعای پاك و بێگەردیان بێ بەش دەبن.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە خۆتان بە "خاوەن ماڵ" دەزانن و ئینکاریی نیعمەت دەکەن. کەچی لە ڕاستیدا ئێوە لە ئاستی دابەشکردنی ماڵی خوا بەسەر بەندەکانیدا لە "جێنشین" زیاتر هیچی تر نین.

بەڵام ئەگەر چاکە و بەخششەکانتان لە پێناوی خوا و بە ناوی زەکاتەوە بێت، ئەوا پاداشتێکی گەلێ گەورەتان دەستگیر دەبێت. بەم کارەشتان

شوكری ئەو نیعمەتانە دەردەبڕن كە خوای گەورە پێی بەخشیون و، دوعا و نزای گیرای ئەو هەژارانەشتان دەست دەكەوێت. چونكە مادەم بەو جۆرە بەخشیوتانە، ئەویش ناچاری ترس و ڕیا نابێت و، كەرامەتی خۆی دەپارێزێت و، ئنجا نزاكانیشی بێگەرد و خاوێن دەردەچن، هەر لەبەر ئەوەش گیرا دەبن.

بەڵێ، ئەوە لە كوێ و.. ئەمە لە كوێ؟

ئەوە لە كوێ كە بە ئەندازەی زەكات - بەڵكو زیاتریش - لە ماڵ و سامان سەرف بكرێت، بەڵام زیانێكی زۆری وەك ڕیا و ناوبانگی تێدا بێت و، خەڵكیش زەلیل و منەتبار بكات..

ئەمەش لە كوێ كە ئەو زەكات و چاكە و بەخششانە لە پێناوی خوادا ببەخشرێن و، خاوەنەكەی بە دەرفەتی بەجێهێنانی یەكێك لە فەرزەكانی خوای بزانێت و، پاداشتی خوای گەورەی دەست بكەوێت و، ئیخلاس و دوعای گیرایشی دەستگیر ببێت.

بەڵێ، جیاوازییەكی گەلێ زۆریان لە نێواندایە!

﴿سُبْحانك لا علمَ لنا إلاّ ما علّمْتنا إنك أنت العليم الحكيم﴾.

اللهم صلّ على سيدنا محمد الذي قال: "المؤمن للمؤمن كالبنيان المرصوص يشد بعضه بعضاً"[٢] وقال: "القناعة كنز لا يفنى"[٣] وعلى آله وصحبه أجمعين. آمين.. والحمد لله رب العالمين.

* * *

(٢) رواه البخاري ومسلم والترمذي عن أبي موسى الأشعري. (وەرگێڕ)

(٣) رواه الطبراني في الأوسط عن جابر بلفظ: "القناعة مال لا ينفد وكنز لا يفنى". (وەرگێڕ)

## "ئەجەل"ی هەموو زیندەوەرێك دەستنیشان کراوە و "ڕۆزی"ش بڕیاری لەسەر دراوە

"ئەجەل" و "ڕۆزی"یەکان بە ڕواڵەت وا دەردەکەون کە دوو شتی تەماوین و دەستنیشان نەکراون، کەچی لە ژێر پەردەی ئەو بارە تەماوی‌یەدا هەردووکیان لە دەفتەری قەزا و قەدەری ئەزەلی و لە لاپەڕەی شتانی تەقدیر کراوی ژیاندا تۆمار و دەستنیشان کراون.

کەواتە "ئەجەل"ی حەتمیی هەریەك لە زیندەوەران دیاری و دەستنیشان کراوە، تەنانەت بۆ یەك دانە سەعاتیش پێش ناخرێت و دوا ناکەوێت..

"ڕۆزی"ی هەموو گیانلەبەرێکیش دەستنیشان و تایبەت کراوە و، لە تۆماری قەزا و قەدەردا نووسراوە.

گەلێ بەڵگەی لە سنوور بەدەر لەسەر ئەم بڕیارە هەیە. یەکێك لەوانە ئەمەی خوارەوەیە:

مردنی درەختێکی گەورە و بە میرات هێشتنەوەی ئەرکی سەرشانی لە تۆوە بچووکەکانیدا - کە وەك جۆرە "گیان"ێك وان سەبارەت بەو - تەنها بەپێی یاسایەکی دانایانەی کەسێکی زانا و پارێزگار نەبێت هەرگیز ئەنجام نادرێت..

هەروەها ئەو شیرە پوخت و خاوێنەی کە وەك ڕۆزییەك لە مەمکی دایکانەوە بۆ منداڵ و بێچوان و، لە نێوان خوێن و سیخوڕی زیندەوەردا - بێ تێکەڵبوون - هەڵدەقوڵێت و، هاتنی بە پوختی و خاوێنی و، خوڕ بوونەوەی بەرەو دەمی ئەو ساوا و بێچووانە، زۆر بە توندی گریمانی "ڕێکەوت" پووچەڵ دەکاتەوە و، هاتنەدیی بەو شێوە بێگومانە ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو کارە ئەنجامی دەستوورێکی بەشەفەقەتە کە لە لایەن ڕۆزیدەرێکی زانا و میهرەبانەوە دانراوە.

ئیتر بۆ خۆت زیندەوەران و گیانلەبەرانی تر بۆ سەر ئەم دوو نموونەیە قیاس بکە و، بەم پێوەرە لێکیان بدەرەوە.

کەواتە لە ڕاستیدا هەریەك لە "ئەجەل" و "ڕۆزی" دەستنیشان کراون و، لە تۆماری شتانی تەقدیر کراودا نووسراون. بەڵام بە ڕواڵەت وا دەردەکەوێت کە لە پشت پەردەی غەیبەوە شارراونەوە و خۆیان بە تاڵە دەزووە نادیارەکانی پەنهانیدا هەڵواسیبێت و، وا پیشان دەدەن کە دەستنیشان نەکراون، وەك بڵێی بەسترابن بە "ڕێکەوت"ەوە..

هەموو ئەمانە، لەبەر حیکمەتێکی تا بڵێی ورد و لە هەمان کاتیشدا تا بڵێی گرنگە، کە ئەمەی خوارەوەیە:

ئەگەر بە ئاشکرا و بە چەشنی ئاوابوونی خۆر کاتی "ئەجەل" دیار بوایە، ئەوا مرۆڤ نیوەی یەکەمی تەمەنی بە بێ ئاگاییەکی تەواوەتی بەسەر دەبرد و، ئەم بەشەی ژیانی بە زایە دەدا و پشتی لە ئاخیرەت هەڵدەکرد. نیوەکەی تریشی بە ترس و بیم دەبردە سەر و، وەکو ئەو کەسەی لێ دەهات کە هەموو ڕۆژێك هەنگاوێکی نوێ بەرەو داری سێدارەکەی بنێت! دیارە ئەو کاتەش موسیبەتی "ئەجەل" بە سەدان جار دووبارە دەبووەوە!

هەر لەبەر ئەم نهێنی‌یە وردەیە کە ئەو موسیبەتانەی هەردەم لە ژیاندا دێنە ڕێی مرۆڤ، لە ژێر پەردەی غەیبدا داپۆشراون. تەنانەت ئەجەلی دنیاش - کە قیامەتە - خوای گەورە بە میهرەبانیی خۆی و لەبەر هەمان هۆ، لە پشت پەردەی غەیبەوە شاردوویەتیەوە.

هەرچی "ڕۆزی"شە ئەوا لەبەر ئەوەی کە لە دوای نیعمەتی "ژیان"بە مەزنترین گەنجینەی ئەوتۆ دادەنرێت کە پڕە لە نیعمەتەکانی تر و، بەپیتترین سەرچاوەیە کە حەمد و شوکری لێ هەڵدەقوڵێت و، گشتی‌ترین کانی بەندایەتی و پاڕانەوە و، جۆرەکانی هیوا و ئومێدە. ئەوا بە ڕواڵەت وا پێش چاو خراوە کە نادیار بێت و، بە "ڕێکەوت"ەوە بەسترابێت، ئەمەش بۆ ئەوەی کە هیچ کات دەرگای پاڕانەوە لە ڕۆزیدەری بەخشندە و، دەرگای تکا و لاڵانەوەی ئاوێتەی حەمد و شوکری خوای گەورە، لە ڕووی مرۆڤدا دانەخرێت..

چونکە ئەگەر بە وێنەی کاتی هەڵهاتن و ئاوابوونی خۆر "ڕۆزی"ش دەستنیشان کراو بوایە، ئەوا حەقیقەت و ماهیەتەکەی بە تەواوی دەگۆڕا و، هەموو دەرگاکانی هیوا و ئومێد و، گشت پەنجەرەکانی لاڵانەوە و، پلیکانەکانی دوعا و نزای ئاوێتەی شوکرانە و ڕەزامەندی، لە بەردەم مرۆڤدا دادەخران. تەنانەت سەرجەمی دەرگاکانی بەندایەتیی پڕ لە خشووع و لاڵانەوەی بەکوڵ، بە تەواوی، لە ڕوویدا دەبەستران!

* * *

لە پاشکۆی دووەمی ئەمیرداغەوە:

## ئەو شارستانێتی یەی کە مرۆڤایەتیی هەژار خست

(مامۆستا نوورسی لە نامەیەکیدا ئەم بۆ قوتابیانی ئەم ڕاستی یەی ڕوون کردووەتەوە کە تایبەتە بە دەستپێوەگرتن و قەناعەت و هەڵخەرجی)

پرسیار:

پێش ئێستا کە تۆ بەناو تیرە و هۆزە گوندنشین و خێڵەکی یەکانی خۆرهەڵات(کوردستان)دا دەگەڕایت و، گەشتت دەکرد و، سەرت لێدەدان، داوای ژیانی شارستانییانەت لێ دەکردن و، بە شەوق و تاسەمەندی و حەزێکی زۆرەوە بەرەو ژیار و پێشکەوتن لە بوارەکانی گوزەران و ژیاندا هانت دەدان..

ئەدی بۆچی وا نزیکی چل ساڵە خۆت لە ژیانی شارستانێتیی سەردەم بەدوور گرتووە و، ئەم شارستانێتی یەی ڕۆژگارت بە (دەنییەت) نەك (مەدەنییەت) - واتە بێ میم - لە قەڵەم داوە و، لە ژیانی کۆمەڵایەتی دوور کەوتوویتەوە و، خۆت ترنجاندووەتە گوزەرانی دوورەپەرێزی و گۆشەگیری؟!

وەڵام:

ئەم شارستانێتی یە خۆرئاواییەی ئێستا، لەبەر ئەوەی ڕێیەکی پێچەوانەی یاسا و دەستوورە ئاسمانی یەکانی گرتووەتە بەر و، بە ڕەفتارەکانی لە دژی ئەو

یاسایانە ڕادەوەستێت، ئەوا تای تەرازووی خراپەکانی بەسەر چاکەکانی و، زیانەکانی بەرامبەر سوودەکانیدا قورس و زاڵ بووە! ئەوەتا بەهۆی ئەو شارستانێتی‌یەوە، ئاسایش و ئارامیی خەڵکی شڵەژاوە و، حەوانەوەیان شێواوە و، بەختەوەریی ڕاستەقینەشیان هێندە گەنیوە کە بۆگەنی بە هەموو لایەکدا بڵاوبووەتەوە و، بەم پێیە ئامانجی ڕاستەقینەی "ژیانی شارستانێتی" تێکچووە و لە شوێنی خۆی ترازاوە..

دەبینیت کە هاندەرەکانی "هەڵەخەرجی" و "هەرزەیی" جێی دەستپێوەگرتن و قەناعەتیان گرتووەتەوە و، مەیل و ئارەزووی تەمبەڵی و پاڵدانەوەش لە مرۆڤدا، کار و کۆششی لە پێش چاو خستووە..

ئەم شارستانێتی‌یە، پۆشاکی هەژاری‌یەکی سەخت و بەرگێکی ترسناکی تەمبەڵی و پاڵ لێدانەوەی بە بەری مرۆڤ پۆشیوە.

جا لەبەر ئەوەی "پەیامەکانی نوور" ئەو دەستوورەی قورئانی پیرۆزیان ڕوون کردووەتەوە کە ڕوو لە گرۆی مرۆڤایەتی دەکات و، لە بانگەوازێکی بەرز و بڵنددا پێیان دەڵێت:

﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا﴾ (الأعراف:٣١).

هەروەها:

﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلإِنْسَانِ إِلاَّ مَا سَعَى﴾ (النجم:٣٩).

ئەوا ئەو پەیامانە، لەبەر تیشکی ڕووناکی و ڕێنمایی ئەو دوو ئایەتە پیرۆزەدا، ئاماژەیان داوە بەوەی کە "بەختەوەریی ژیانی مرۆڤایەتی" بەندە بە:

- دەستپێوەگرتن و ئیسراف نەکردن..
- هاندان و ورووژاندنی هیممەتەکان بۆ هەوڵ و کار و تێکۆشان.

هەروەها ڕوونیان کردووەتەوە کە تەنها بەم دوو مەرجە دەتوانرێت "هاوکاری" و "لەگەڵ یەك گونجان" بخرێتە نێوان هەردوو چینی "خەواص و عەوام"ی مرۆڤایەتی‌یەوە.

لەبەر ئەوەی "پەیامەکان" ئەمەیان ڕوون کردووەتەوە، ئەوا لێرەدا تەنها دوو مەسەلە و سەرنجی ورد و ناسك دەخەمە ڕوو:

**یەکەمیان:**

مرۆڤ لە قۆناغی دەشتەکێتی و خێڵایەتیدا "سێ" یان "چوار" دانە شتی پێویست بوو بۆ گوزەران و ژیانی. ئنجا لە دە کەسدا تەنها دوو کەس هەبوون نەیاندەتوانی هەر سێ، یان هەر چوار شتەکان بەدەست بهێنن..

بەڵام لەم سەردەمەدا و لە ژێر پاڵەپەستۆی خۆسەپێنەری شارستانێتیی خۆرئاوادا، کە شەقڵ و نیشانە جوداکەرەوەکانی بریتین لە چەند سیفەتێکی وەك:

وروژاندنی لایەنی بەکارهێنانی هەڵە و خراپی دەسکەوتەکانی ژیان و..

هاندانی خەڵکی بۆ هەڵەخەرجی و..

هەژاندنی هەوا و ئارەزووەکانی دەروون و..

لە قەڵەمدانی شتانی ناپێویست، بە چەند شتێکی یەکجار پێویست و ناچارەکی..

ئا لەم سەردەمەدا، بە پاڵەپەستۆی ئەو شارستانێتی‌یەی کە ئەم خاڵانە هەندێکن لە تایبەتکاری‌یەکانی، مرۆڤ لە ڕووی "چاولێکەری" و "خووپێوەگرتن"ەوە، لە بریی چوار دانە پێویستی، بۆ بیست دانە ناچار کراوە!

خۆ مەگەر لەناو بیست کەسدا تەنها دوانیان بتوانن لە سەرچاوەیەکی حەڵاڵ و بە شێوەیەکی موباح ئەو بیست دانە پێداویستی‌یانە بۆ خۆیان بەدەست بهێنن، بەڵام هەژدە کەسەکەی تریان هەر بە هەژاری و دەستکورتی دەمێننەوە!

کەواتە ئەم شارستانێتی‌یەی ئێستا، بە تەواوی مرۆڤ گیرۆدەی هەژاری و دەستکورتیی بەردەوام دەکات. ئەوەتا لە ڕێی هاندانی خەڵکی‌یەوە بۆ

بەدەستهێنانی ئەو پێداویستی‌یە داسەپاوانە، ئەم شارستانێتی‌یە، گـرۆی مرۆڤـی بـەرەو حـەرام خۆریی زیـاتر و، جۆرەهـا پێشـێل کردنـی حـەق و، چـەندین نـاڕەوایی دایەبـەر و، چینـی "هـەژاری عـەوام"ی بۆ ململانێ و دەسـتەویەخە بوونی بەردەوام هان دا لە گەڵ چینی "خەواص"دا، بەهۆی پشتگوێ خستنی ئەو یاسا بنەڕەتی‌یەی کە قورئانی پیرۆز دایڕشتووە و بریتی‌یە لە واجب کردنی "زەکات" و حەرام کردنی "سوود". کە ئەگەر ئەم یاسایە لـە ژیـاندا جێبـەجێ بکرایـە، ئـەوا ڕێـزی "عامـە"ی خـەڵکی بـۆ "خـەواص" و سـۆز و میـهرەبانی خەواصیش بۆ عامەی خەڵکی دابین دەبوو..

بـەڵام بـە پشـتگوێ خسـتنی ئـەو یاسـا بنەڕەتی‌یـە، شارسـتانێتیی نـوێ بۆرژوازی‌یەکانی هان دا ستەم لە هەژاران بکەن و، بـە نـاڕەوا مافیـان بخۆن و زەوتـی بکـەن، هـەروەها هەژارانیشی ناچـار کـرد کـە لـە بورژوازی‌یـەکان هەڵبگەڕێنەوە و لە دژیان ڕابووەستن.. ئیتر ئەم شارستانێتی‌یە - لەم ڕێیـەوە - حەوانەوە و بەختەوەریی لـە بـەری مـرۆڤ دامـاڵی و، ئـارامی و ئاسایشـی لـێ تێکدا و، گرفتاری ئەو بارەی ئێستای کرد کە پێوەی دەتلێتەوە.

**سەرنجی دووهەمیان:**

ئەو کارە دەراسایانە(خوارق)ی کە شارستانێتی نـوێ لـە بـواری زانستدا بەدەستی هێنـاون، لـە ڕاسـتیدا چـەند نیعمـەتێکی گـەورەی پـەروەردگاری بەخشندەن و، داخوازی ئەوەن کە مـرۆڤ لـە بەرامبەریانـەوە شـوکرانەبژێریی خـاوێن و بێگـەرد پێشـکەش بکـات و، بـە چەشـنێکی شایسـتە و گونجـاو لـە پێناوی سوود و بەرژەوەندیی مرۆڤدا بەکاریان بهێنێت..

بەڵام ئەوەی کە ئێمە لەم ڕۆژگارەدا دەیبینین پێچەوانـەی ئـەم داخوازی‌یـە ناوبراوەیە. دەبینین ئەو کارە دەراسایانە کەسـانێکی بایـەخدار و گرنگیـان لـە ژیاندا بەرەو تەمبەڵی و هـەرزەیی داوەتەبـەر، چونکـە هـەردەم ئـاگری هـەوای دەروون دادەگیرسێنن و، ئارەزووەکانی دەورووژێنـن، بەمـەش پـتر مـرۆڤ لـە

هەوڵ و کۆشش دوور دەخەنەوە و، لە شەوقی کار و تێکۆشانیش سارد و سستی دەکەنەوە و، لە ڕێی بێ قەناعەتی و دەست پێوەنەگرتنیشەوە بەرەو هەرزەیی و، هەڵەخەرجی و، ستەم و، حەرام خۆری دەیبەن.

وا لێرەدا نموونەیەك بۆ ئەمە دەهێنمەوە (وەك لە پەیامی "کلیلی جیهانی نوور"دا باسکراوە):

"ڕادیۆ" نیعمەتێکی مەزنی خوای گەورەیە کە بە گرۆی مرۆڤی بەخشیوە.

جا لە کاتێکدا کە دەبوو شوکرانەی مەعنەویمان لەسەر ئەو نیعمەتە پێشکەش بە خوا بکردایە، بەوەی کە لە بەرژەوەندیی سەرجەمی مرۆڤایەتیدا بەکارمان بهێنایە، کەچی دەبینین چوار لەسەر پێنجی بەکارهێنانی ئەو نیعمەتە لە ورووژاندنی هەوا و ئارەزووە دەروونی‌یەکان و، چەندین شتی بێ نرخدا - کە هیچ سوودێکیان بۆ مرۆڤ تێدا نی‌یە - بەکاردەهێنرێن!

ئنجا دەبینین ئەم بەکارهێنانە هەڵە و خراپەی ڕادیۆ، شەوق و حەزی مرۆڤ بۆ کار و کۆشش لە بنج و ڕەگدا دەردەهێنێت و، گرفتاری تەمبەڵی و پاڵدانەوەی دەکات بە مەبەستی حەوانەوە و لەزەت بردن لەوەی گوێی لێ ڕابگرێت، بە ڕادەیەك مرۆڤ بە خۆیەوە سەرقاڵ دەکات کە بچێت لەو پێناوەدا واز لە کارمەندی و ئەرکی ڕاستەقینەی سەرشانی ژیانیشی بهێنێت، تەنها لەبەر ئەوەی کە ئەو لەزەتەی لەکیس نەچێت!

واتە لە کاتێکدا کە پێویست بوو بەشێکی زۆری ئەو هۆکار و بەدەستهاتە دەراسایانە لە پێناوی بەرژەوەندیی ڕاستەقینەی مرۆڤ و، لە ڕێی هەوڵ و کار و کۆششدا بۆ خێر و قازانجی مرۆڤایەتی بەکار بهێنرایە و، پێداویستی‌یەکانی پێ نەهێڵرانایە و، گیروگرفتەکانیشی لەو ڕێیەوە چارەسەر بکرانایە.. کەچی هەر بە چاوی خۆم بینیم کە لە نێوان دە دانەدا تەنها یەك دوانێکیان بۆ هێنانەدی و دابینکردنی خواست و پێداویستی‌یەکانی مرۆڤ

بەکار دەهێنرێن و، هەشت بەشەکەی تریان لە کاری گاڵتەوگەپ و، پێ ڕاکێشان لە وروژاندنی هەوا و ئارەزووی دەروون و، تەمبەڵی و، پاڵ لێدانەوە و، کات کوشتندا بەسەر دەبرێن!

هەزاران نموونەی تری وەك ئەم دوو نموونە بچووکە هەن.

**پوختەی ئەم قسانە:**

شارستانێتیی ئێستای خۆرئاوا، بە تەواوی گوێ لە ئایینە ئاسمانی‌یەکان ڕاناگرێت. لەبەر ئەوە، مرۆڤایەتیی بە هەژاری‌یەکی گەلێ سەختەوە تلاندووەتەوە و، داخوازی و پێداویستی‌یەکانیشی بە چەندین قات لەسەر زیاد کردووە..

ئنجا پتر لە وروژاندنی ئاگری هەڵەخەرجی و، هەڵپەکاری و، تەماعیشدا پێ ڕادەکێشێت، پاش ئەوەی کە بناغەی دەستپێوەگرتن و قەناعەتی هەڵتەکاند و، ڕێگاکانی ستەم و حەرامکاری و حەرام خۆریی لە بەردەمدا والا کرد.. زیاد لەمانەش - بەو هۆکارانەی کە ڕابورد - ئەم مرۆڤە هەژار و دەستکورتەی هاویشتە ناو باوەشی تەمبەڵی و دەست بەتاڵی‌یەکی ڕووخێنەر و بێ بەرهەمەوە، دوای ئەوەی کە بەرەو هۆکارەکانی "هەرزەیی" هانی دا و پاڵی پێوە نا.

بەم چەشنە، شەوق و حەزی کارکردنی لە مرۆڤدا ڕەواندەوە.

مرۆڤیش لەم ڕێیەوە تەمەنە بەنرخەکەی خۆی لەدەست دا و، بە مفتە لە شوێنکەوتنی هەرزەیی و، گاڵتەوگەپ و، هەوا و ئارەزووی شارستانێتیی سەردەمدا، لە ناوی برد.

جگە لەمانەش، شارستانێتیی ئەم ڕۆژگارە، مرۆڤی هەژار و دەست بەتاڵی دووچاری چەندین نەخۆشی و بیماری کرد و، لە ڕێی ئیسراف و بەکارهێنانی هەڵە و خراپی دەسکەوتەکانیەوە، چەندەها دەرد و پەتای لەناو گرۆی مرۆڤی سەرانسەری گۆی زەویدا بلاو کردەوە!

مەسەلەی پێنجەمی
مەکتووبی بیست و هەشتەم:

# پەیامی شوکر

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾ (الإسراء:٤٤)

قورئانی پیرۆز، بە ڕوونکردنەوەی ئیعجازبەخشی خۆی، لە گەلێ ئایەتیدا باسی شوکرانەبژێریی کردووە و خەڵکیی بۆ هان داوە، کە ئەمانەی خوارەوە هەندێکن لەو ئایەتانە:

﴿أَفَلا يَشْكُرُون﴾ (يس:٣٥)..

﴿أَفَلا يَشْكُرُون﴾ (يس:٧٣).

﴿وَسَنَجْزِي الشَّاكِرِين﴾ (آل عمران:١٤٥).

﴿بَلِ اللهَ فَاعْبُدْ وَكُنْ مِنَ الشَّاكِرِين﴾ (الزمر:٦٦).

قورئانی پیرۆز لەم ئایەتانەدا دەری دەبڕێت کە مەزنترین کردارێك بەدیهێنەری میهرەبان لە بەندەکانی داوای دەکات بریتییە لە "شوکر". چونکە بە ڕاشکاوی و ئاشکرا خەڵکی بۆ شوکرانە و سوپاسگوزاری بانگ دەکات و، بایەخێکی تایبەتیی دەداتێ، بەوەی کە دەری دەخات پشت هەڵکردن لە شوکرانەبژێری - لە ڕاستیدا - بەدرۆخستنەوە و دان نەنانە بە نیعمەتەکانی خوای گەورەدا!

هەروەها لە سوورەتی "الرحمن"دا لە ڕێی ئایەتی: ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبان﴾ەوە، بە شێوازێكی ترسناك سی و یەك جار هەڕەشەی توندوتیژی ئاراستەی گرۆی ئادەمی و جینی كردووە و، دەری خستووە كە پشتگوێ خستنی شوكرانەی خوای گەورەی نیعمەتبەخش لە ڕاستی و ناوەڕۆكدا بەدرۆخستنەوە و ئینكاری و ملنەدانە بۆ ئەو نیعمەتانەی خواوەند.

ئنجا هەروەك قورئانی پیرۆز ڕوونی دەكاتەوە كە "شوكر" ئاكام و ئامانجی بەدیهێنانی بوونەوەرانە.. بە هەمان جۆر "گەردوون"یش، كە وەك قورئانێكی مەزنی بەرجەستە وایە، دەری دەخات كە گرنگترین ئەنجامی بەدیهێنانی بوونەوەران بریتی‌یە لە "شوكرانەبژێری". چونكە ئەگەر بە وردی سەرنجی بوونەوەران بدرێت، دەردەكەوێت كە:

ڕوخساری گەردوون و شتانی ناوی بە شێوەیەك نەخشەیان كێشراوە و، بە چەشنێكی ئەوتۆ دارێژراون كە "شوكر" بەرهەم بهێنن و، ئەنجامی شتەكانیش بەرەو شوكرانەبژێری ببەن. ئەوەتا هەموو شتێك - لە ڕوویەكەوە - ڕووی لە شوكرانەیە، تەنانەت گرنگترین بەری درەختی بەدیهاتووان شوكرانەبژێری‌یە، بگرە سوپاسگوزاری و شوكرانە كردن نایابترین و بەنرخترینی ئەو كاڵایانەیە كە كارگەی گەردوون بەرهەمیان دەهێنێت، چونكە ئێمە دەبینین كە:

بوونەوەرانی ناو ئەم جیهانە بە شێوە و تەرزێك نەخشەیان كێشراوە و ڕێ و شوێنیان بۆ دیاری كراوە كە وەك بازنەیەكی مەزن وابن.. ئنجا "ژیان"یش بە چەشنێك بەدی هێنراوە كە چەقە خاڵی ئەو بازنەیە بنوێنێت. دەبینیت سەرجەمی بوونەوەران لە خزمەتی "ژیان"دان و ڕوویان لێیەتی و سەرپەرشتی و چاودێریی دەكەن و، گەشەپێدانی كەرەسە و پەرەپێدان و دابین كردنی پێداویستی‌یەكانی "ژیان" دەخەنە ئەستۆی خۆیانەوە. كەواتە بەدیهێنەری گەردوون لە نێوان بەدیهێنراوانی خۆیدا "ژیان" هەڵدەبژێرێت..

پاشان کە تەماشای جیهانی زیندەوەران (واتە خاوەن ژیانەکان) دەکەین، دەبینین لە شێوەی بازنەیەکی فراواندا بەدی هێنراون و، "مرۆڤ"یش لە چەقی ئەو بازنەیەدا پلەی بۆ دیاری کراوە و، سەرجەمی ئامانج و مەبەستەکانی زیندەوەران لەودا جەم بوون و، بەدیهێنەری بەخشندە هەموو شتانی لە دەوری مرۆڤدا کۆکردووتەوە و، لەبەر مرۆڤ و لە پێناوی خزمەتگوزاریی ئەودا ژێربار و گوێڕایەڵی کردوون و، مرۆڤی بە سەردار و فەرمانڕەوای ئەوان داناوە. کەواتە بەدیهێنەری گەردوون لە نێوان خاوەن ژیانەکاندا "مرۆڤ" هەڵدەبژێرێت و دەیکات بە جێی ویست و ئیختیاری خۆی..

پاشان جیهانی مرۆڤ و تەنانەت جیهانی زیندەوەرانی تریش - بە هەمان جۆر- لە شێوەی بازنەیەکی تردا دەبینین کە لە چەقی ئەو بازنەیەدا "ڕۆزی" دانراوە. ئنجا تاسە و شەوقی "بەدەستهێنانی ڕۆزی"ش لە ناخی مرۆڤ و سەرجەم زیندەوەرانی تردا جێگیر کراوە، ئەوەتا دەبینین کە هەر هەموویان - بەم شەوق و تاسەمەندیەیان - بوون بە خزمەتگوزار و ملکەچ و گوێڕایەڵ و ژێرباری "ڕۆزی". چونکە "ڕۆزی" فەرمانڕەوایانە و بەسەریاندا زاڵ و دەستەڵاتدارە..

ئنجا دەبینین خودی "ڕۆزی"یش کراوە بە گەنجینەیەکی مەزن و فراوانی ئەوتۆ کە ئەگەر گشت جۆر و نیعمەتەکانی تێدا جەم بین و ڕەچاو بکرێن ئەوا هێندە زۆر دەردەچن کە لە ژمارە نەیەن. (تەنانەت دەبینین هەر تەنها "هێزی چەشتن" لەناو زماندا، بە ئەندازەی ژمارەی خواردەمەنیەکان، وردیلە کۆئەندام و تەرازووی هەستیاری مەعنەویی تێدا دانراوە کە تامی هەموو چێژەکانی ڕۆزیە جۆراوجۆر و زۆر و زەبەندەکانیان پێ بزانێت).

کەواتە "ڕاستیی ڕۆزی" سەرسووڕهێنەرترین و بەپیتترین و سەیر و نامۆترین و شیرینترین و گشتیترینی ڕاستیەکانی ناو گەردوونە..

پاشان هەروەك هەموو شتان لە دەوری "ڕۆزی" کۆبوونەتەوە و چاویان تێبڕیوە، دەبینین خودی "ڕۆزی"ش (بە ماددە و، ناوەڕۆك و، لە حاڵ و مەقامدا و، بە گشت جۆرەکانیەوە) پابەندی شوکرە و، بە شوکرانەوە پەیوەستە و، لە ڕێی شوکرانەبژێریەوە دەست دەکەوێت و، شوکرانەش بەرهەم دەهێنێت و، دەیخاتەڕوو. چونکە حەز و تاسە و شەوقی زیندەوەر بۆ "ڕۆزی" جۆرێکی سروشتیی شوکرانەیە، تەنانەت لەزەت چەشتنیشی لەو ڕۆزیەیە هەر بە شوکرانەبژێری دادەنرێت، بەڵام بە شێوەیەکی ناهەستی (غیر شعوری). دەبینیت سەرجەمی زیندەوەران لەم شوکرانەیەدا بەشدارن، جگە لە مرۆڤ کە بە تەنها خۆی لەناو ئەواندا ڕێیەکی جیاواز دەگرێتەبەر و، بە شوێنکەوتنی کوفر و گومڕایی ماهییەتی ئەو شوکرە سروشتیە دەگۆڕێت و، لە پلەی بلندی "شوکرانەبژێری"یەوە بەرەو قووڵایی بنکی "شیرك" خۆی دەهاوێتە خوارەوە.

پاشان دەبینین هەموو نیعمەتەکان - کە ڕۆزیی زیندەوەرانن - بە چەندین وێنەی ڕەنگین و ناوازە و قەشەنگ ڕازاونەتەوە و.. بۆن و بەرامەی عەترین و خۆش بە دەوری خۆیاندا پەخش دەکەن و.. دارای گەلێ تام و چێژ و لەزەتی زۆر و زەبەندەن..

هەموو ئەم دیاردانەی کە بە نیعمەت و ڕۆزیەکانەوەن - لە ڕاستیدا - چەند دەلاڵ و ڕێ پیشاندەرێکن کە زیندەوەران بەرەو "شوکرانەبژێری" ڕێنمایی دەکەن! چونکە تاسە و شەوق لە زیندەوەراندا دەورووژێنن و، بەرەو جۆرێکی ڕێزلێنان و قەدرزانی و نرخ شناسیی ڕۆزیەکان هانیان دەدەن و، شوکرێکی مەعنەویان تێدا جێگیر دەکەن و، سەرنجی خاوەن هەستانیش بۆ تێڕامان و بیرکردنەوە لەو نیعمەتانە ڕادەکێشن و، دەیانخەنە بارێکی ئەوتۆوە کە ئەو نیعمەتانەیان بەلاوە گەلێ جوان و قەشەنگ بێت و، سەرسووڕمانی

خۆیان لە ئاستیاندا دەربېڕن و، بەرەو ڕێزنانی شایستە و گونجاو لەو نیعمەتانە، هەڵیاندەنێن و هانیان دەدەن.

کەواتە ئەو نیعمەتانە، سەرجەمی خاوەن هەستان بەرەو شوکرانەبژێریی (بە کردار و گوفتار) شارەزا و ڕێنمایی دەکەن و، دەیانخەنە ڕیزی شوکرانەبژێرانەوە و، لە ناوەندی ئەم شوکر و سوپاسگوزاری‌یەشدا بەنرخترین و خاوێنترین و بەتام و چێژترین لەزەتیان دەرخوارد دەدەن! چونکە بۆ خاوەن هەستانی دەردەخەن کە ئەو نیعمەت و ڕۆزی‌یە خۆش و بەتامانە لەزەت و بەهرەیەکی ڕواڵەتی و کاتین و، هی ماوەیەکی کورت و کەم خایەنن، بەڵام ئەگەر شوکرانەیان لەسەر بکرێت، ئەوا بەو شوکرانەیە، بیری مرۆڤ بۆ "ئاوڕلێدانەوەی میهرەبانیی خواوەند" بێدار دەکەنەوە کە لە ڕاستیدا تام و چێژێکی بێگەردی ڕاستەقینە و هەمیشەیی و نەبڕاوەیە..

واتە لەبەر ئەوەی "ڕۆزی" بەم شوکرانەبژێری‌یە، ئاوڕلێدانەوەی خواوەندی بەخشندە و خاوەنی گەنجینەکانی میهرەبانیی فراوان یادی مرۆڤ دەخاتەوە (ئەو ڕێزلێنان و ئاوڕدانەوەیەی کە تام و چێژێکی نەبڕاوەی بێ سنووری تێدایە) ئەوا بەم هەست و بیرکردنەوەیە و، هەر لەم دنیایەدا چێژ و تامێکی مەعنەویی بەهەشتی هەمیشەیی بە مرۆڤی شوکرانەبژێر دەبەخشن.

جا هەروەك بەهۆی شوکرانەبژێری‌یەوە "ڕۆزی" دەبێت بە گەنجینەیەکی گشتی و فراوانی گەلێ بەپیت و بەرەکەت و بەتام و لەزەت، بە وازهێنانیش لەو شوکرانەبژێری‌یە و گوێ پێ نەدانی، لەو پلە بڵندەی خۆی دەترازێت و بە تەواوەتی دەکەوێتە خوارەوە.

لە "وتەی شەشەم"دا ڕوونمان کردووەتەوە کە:

ئەگەر کار و ئەرکی هەستەوەری "تام چەشتن"ی ناو زمانی مرۆڤ ڕووی لە خوای گەورە بێت و، لە پێناوی ڕەزامەندیی ئەودا خرابێتە کار، واتە لەبەر ئەنجامدانی ئەرکی "شوکرانەبژێریی مەعنەوی" ڕووی لە "ڕۆزی" کردبێت،

ئەوا هەست و هێزی تام چەشتنی ناو زمان لە حوکمی سەرپەرشتیکارێکی شوکرانەبژێر و بەڕێوەبەرێکی سوپاسگوزاری خاوەن ڕێز و ویقار و پایەداردا دەبێت بەسەر خواردنگەکانی میهرەبانیی بێ سنووری خوای گەورەدا!

بەڵام هەر کات کار و ئەرکی سەرشانی دەروون بۆ مەبەستی تێرکردنی ئارەزووەکانی بێت، واتە بێ هیچ بیرکردنەوەیەك لە "نیعمەتبەخش" ڕووی لەو ڕۆزی و نیعمەتانە کرد، ئەوا "هێزی چەشتنی" ناو زمان لەو پلە و پایە بەرز و بلندەی خۆیەوە - کە پلەی سەرپەرشتیکاری دەستپاك و ئەمینە - بەرەو پلەی دەرگاوانی "کارگەی سك" و پاسەوانی "پشتیری گەدە" دادەبەزێتە خوارا

جا هەروەك ئەم خزمەتگوزارەی ڕۆزی (واتە هێزی تام چەشتنی ناو زمان) بەم پشت هەلکردنەی لە شوکرانەبژێری، بەرەو پلەیەکی ئاوا نزم شۆڕ دەبێتەوە.. بە هەمان جۆر، ماهییەتی خودی "ڕۆزی" و سەرجەم خزمەتگوزارەکانی تریشی، بە هەمان ڕێژە، لە بلندترینی پایە و پلەیانەوە بەرەو بنکی نزمترین پلەی "نزمی" دەکەونە خوارەوە، تەنانەت گرفتاری بارێکی هێندە نزم دەبن کە بە تەواوەتی جیاواز و دوورە لە "دانست"ی بەدیهێنەری مەزنەوە.

پێوەر و نیشانەی شوکر: قەناعەت و، دەستپێوەگرتن و ڕازی بوون و، منەت زانینی نیعمەتبەخشە.. بەڵام نیشانە و پێوەری ناشکوری و گوێ نەدان بە سوپاسگوزاری: هەلپە و، ئیسراف و، قەدر نەزانی و، هەللووشینی هەرەمەکیی هەموو شتێکە بێ پرسینەوە لە حەڵاڵ و حەرام!

بەڵێ، هەلپەکاری هەروەك لە لایەکەوە بریتییە لە گوێ نەدان بە شوکرانەبژێری و پشت هەلکردن لە سوپاسگوزاری.. لە لایەکی ترەوە هۆی بێ بەشی و سووکی و ڕیسواییشە! تەنانەت "مێروولە" کە گیاندار و مێرووپەکی موبارەکە و خاوەنی ژیانێکی کۆمەڵایەتییە، لە پێناوی هەلپەی

توندوتیژی بۆ ڕۆزی و، لە ئەنجامی لاوازیی قەناعەتەکەیەوە، "ژێـر پـێ"ی ڕێبواران دەکەوێت و دەپلیشێتەوە! چونکە لە کاتێکدا کە چەند دەنکە گەنمێك سەروزیادی پێویستیی ساڵێکی تەواوی ئەوە، کەچی قەناعەتی نی‌یە و، هەر بە دوای ڕۆزیدا دەگەڕێت و، گەر بتوانێت هەزاران دەنکە گەنم بۆ ئەو ساڵەی کۆدەکاتەوە، تا لەو پێناوەدا تیادەچێت!!

بەڵام "هەنگ" کە مێروویەکی قەناعەتکاری تەواوە، بە وێنەی ئەو نی‌یە، چونکە قەناعەتەکەی هێندە بڵندیی دەداتێ کە لەو بەرزاییەوە باڵ بگرێتەوە و لە سەرووی ئاستی "سەر"ی خەڵکی‌یەوە بفرێت و، بە دوای ڕۆزیدا بگەڕێت! ئیتر قەناعەت بە ڕۆزی‌یەکەی خۆی دەکات و، بە فەرمانی خوای گەورەش چاکەمان لەگەڵدا دەنوێنێت و، هەنگوینێکی پوخت و بێگەرد دەکاتە دیاری و پێشکەشی گرۆی مرۆڤی دەکات!

بەڵێ، ناوی "الرحمن"ی خوای گەورە، کە یەکێکە لە ناوە هەرە مەزنەکانی و، ڕاستەوخۆ لە دوای ناوی "الله"وە دێت، کە ئیسمی ئەعزەم و ناوی "عەلەم"ی زاتی خاوێن و بێگەردی خوایە.. ئەم ناوی "الرحمن"ە، "ڕۆزی" دەخاتە ژێر چاودێریی خۆیەوە..

لەبەر ئەوە، مرۆڤ دەتوانێت بەو شوکرانەبژێری‌یەی کە لە دوو توێی ڕۆزیدا هەیە، بگات بە نوورەکانی ئەم ناوە مەزنەی خوای گەورە. دەبێ ئەوەش بزانین کە ئاشکراترینی واتاکانی "الرحمن" بریتی‌یە لە "الرزاق".

پاشان "شوکرانەبژێری" چەندین جۆری جیاجیای هەیە. بەڵام گشتی ترین و هەمەکی‌ترینی ئەو جۆرانە و پێرستە گشتی‌یەکەیان بریتی‌یە لە "نوێژ"!

هەروەها شوکرانەبژێری "ئیمان"ێکی ساف و خاوێن و، "تەوحید"ێکی بێگەردی لە دووتوێدایە، چونکە ئەو کەسەی "بە ناوی خوا"وە سێوێك دەخوات و لە کۆتاییشدا "الحمد لله"ی لەسەر پێشکەش دەکات، بەم شوکرانەبژێری‌یەی، ڕایدەگەیەنێت کە ئەو سێوە یادگارێکی گەورەی

ڕاستەوخۆی دەستی توانستی خوای گەورەیە و، دیارییەکە یەکسەری لە گەنجینەی خواوەندەوە دەرچووە..

کەواتە ئەو کەسە - بەم وتە و باوەڕەی - سەرجەمی شتانی هەندەکی و هەمەکی، ڕاستەوخۆ بە دەستی توانستی خواوەند دەسپێرێت و، پەی بە درەوشانەوەی میهرەبانیی خوای گەورە لە هەموو شتێکدا دەبات و، لەم ڕێیەوە "ئیمان"ێکی ڕاستەقینە و "تەوحید"ێکی بێگەرد دەردەخات.

وا لێرەدا تەنها لە یەك ڕووی ئەو زیانە زۆرانە دەدوێین کە بە ناشکوری و پێ نەزانینی نیعمەتەکان مرۆڤی بێ ئاگا دووچاریان دەبێت:

ئەگەر کەسێك نیعمەتێکی بەلەزەتی نۆشی و شوکرانەی پەروەردگاری لەسەر پێشکەش کرد، ئەوا بەو شوکرانەبژێرییە نیعمەتەکەی بۆ دەبێت بە نوورێکی ڕووناکی بەخش و بەرێکی بەهەشت لەودنیای هەمیشەییدا..

ئنجا وێرای ئەو تام و لەزەتەش کە لێی بەرخوردار دەبێت، هەر لەم دنیایەشدا، کاتێ بیر دەکاتەوە لەوەی کە ئەو نیعمەتە ئاسەوارێکی ئاوڕ لێدانەوە و ڕێزلێنانی میهرەبانیی خوای گەورەیە، هەر تەنها ئەم بیرکردنەوەیە، لەزەتێکی مەزنی بەرز و بێ سنووری پێ دەبەخشێت..

بەم پێیە، مرۆڤی شوکرانەبژێر ئەم چەشنە کاکڵە خاوێن و، پوختە ساف و بێگەردانە و، ئەم ماددە و کەرەسە مەعنەوییانە بەرەو ئاستێکی بڵندی وەك ئەو پلە و پایانە دەنێرێت و، ئنجا توێکڵ و ماددە بێ سوودەکانیشیان، کە ئەرکی ئەستۆیان تەواو کرد و کاری خۆیان ئەنجام دا و مرۆڤ پێویستی پێیان نەما، دەبن بە چەند زبڵ و پاشەڕۆیەك کە بۆ توخمە بنەڕەتییەکانیان دەگەڕێنەوە.

بەڵام گەر ئەو کەسە شوکری نیعمەتی پێشکەشی پەروەردگار نەکرد، بگرە بەلایەوە نەنگی بوو کە سوپاسگوزاری لە ڕووی خوادا بنوێنێت، ئەوا

هەر ئەو لەزەتە کاتی‌یە، لە دوای خۆی، بە نەمانەکەی ئازاری مرۆڤ دەدات و، خەم و پەژارەی نەمانی بۆ جێدەهێڵێت و، بۆ خۆیشی دەبێت بە پاشەڕۆیەکی چەپەڵ..

بەم چەشنە، ئەو نیعمەتە ئەڵماس ئاسا و گرانبەهایە دەگۆڕێت و هێندە بێ نرخ و بەها دەردەچێت کە وەك خەڵووزی بێ بایەخی لێ دێت!

کەواتە ڕۆزی‌یە فانی و لەناوچووەکان، بە بۆنەی "شوکرانەبژێری"یەوە، چەندەها تام و لەزەتی بەردەوام و بەروبوومی هەمیشەیی بەرهەم دەهێنن..

بەڵام ئەو نیعمەتانەی کە شوکرانەیان لەسەر نەکراوە، لە شێوە و دیمەنە بەرز و جوانەکەیان لادەدەن و، وێنەیەکی نزمی بێزلێکراوی چەپەڵ دەگرنە خۆیان. چونکە مرۆڤی بێ ئاگای ناشوکر پێی وایە کە ئەو ڕۆزی‌یە - دوای لەزەت لێبردنی- جگە لە پاشەڕۆ هیچ ئەنجامێکی دیکەی نی‌یە!

بەڵێ، ئەو "ڕۆزی"یەی شوکرانەبژێریی لەسەر کرابێت، وێنەیەکی هێندە ڕوونە کە شایانی عیشق و خۆشویستنە، دەنا عیشق و هەڵپەی بێ ئاگا و گومرایان بۆ "ڕۆزی" جگە لە ئاژەڵێتی هیچی تر نی‌یە!

بۆ خۆت بیر لەمە بکەرەوە با مەودای زەرەری گومرا و بێ ئاگایان بزانیت و، ڕادەی زیانیان هەڵبسەنگێنیت.

لەناو سەرجەمی زیندەوەراندا تەنها "مرۆڤ"ە کە پتر لە هەموویان پێویستی بە ڕۆزی بێت، چونکە خواوەندی مەزن مرۆڤی لەسەر شێوەی ئاوێنەیەك دروست کردووە کە سەرجەمی ناوە جوانەکانی خۆی تێدا دەرخستووە و، وەك موعجیزەیەکی ئەوتۆش بەدیی هێناوە کە بەڵگەی توانستی ڕەهای ئەو بێت، ئەوەتا چەندەها کۆئەندامی وەهای پێ داوە کە بەهۆیانەوە دەتوانێت هەموو نیعمەتە پاشەکەوت کراوەکانی ناو گەنجینەکانی میهرەبانیی فراوانی خوای گەورەیان پێ هەڵبسەنگێنێت و بیانناسێت..

هەروەها لە شێوەی ئەو جێنشینەی زەویدا دروستی کردووە کە خاوەنی هێندە ئامێری هەستیار و کۆئەندامی وەهایە بتوانێت لە ڕێیانەوە وردترینی وردە کاریيەکانی درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوایان پێ لێکبداتەوە..

جا لەبەر هەموو ئەمانە، خوای گەورە لەم مرۆڤەدا "هەژاری"یەکی بێ سنووری داناوە و موحتاجی گشت جۆرە لە سنووربەدەرەکانی "ڕۆزی"ی ماددی و مەعنەویی کردووە، ئنجا ئەو تاکە هۆکار و تەنیا ڕێگایەش کە دەتوانێت لە ناوەندی ئەو "هەمەلایەنی"یەی ماهییەتی مرۆڤدا بۆ مەزنترین پلە، کە پایە و مەقامی ﴿أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ە، ئادەمیزاد سەربخات، بریتیيە لە: "شوکرانەبژێری"!

خۆ ئەگەر "شوکر" لە گۆڕێدا نەما، مرۆڤیش بەرەو نزمترینی پلە نزمەکان پێی دەترازێت و لەو پایە و مەقامەوە دەکەوێتە خوار و، لەم ڕێیەوە ستەمێکی گەلێ مەزن لە خۆی دەکات!

**پوختەی قسە:**

"شوکر" مەزنترینی ئەو چوار بناغانەیە کە ڕێبواری مەزنترین ڕێگا دەیگرێتەبەر، کە ڕێی "بەندایەتی و.. خۆشویستن لەبەر خوا و.. مەحبووبییەت"ە.

ئەو چوار بناغانەش بەم شێوەیەی خوارەوە تەعبیر کراون:

"در طريق عجزمندى لازم آمد چار چيز:

عجز مطلق.. فقر مطلق.. شوق مطلق.. شكر مطلق..

اى عزيز! [1] ".

---

(١) واتە: ئەی برای ئازیزی دەستەوسان! لە ڕێی "کۆڵەواری و دەستەوسانی"دا دەبێ چوار شت ئەنجام بدەیت: کۆڵەواری و دەستەوسانیی ڕەها.. هەژاریی ڕەها.. شەوق و تاسەمەندیی ڕەها.. شوکرانە بژێریی ڕەها.. (وەرگێڕ)

# سوپاسگوزاریی نیعمەتی ئیمان

ئەم باسە تایبەتە بە (الحمد لله)وە. نۆ سوودی نیعمەتە لەژمارەبەدەرەکانی ئیمانی تێدا ڕوون دەکەینەوە، لەوانەی کە دەمانخەنە شوکرانەبژێرییەکی بەردەوامەوە.

● خاڵی یەکەم:

پێویستە سەرنجی خوێنەر بۆ دوو تێبینیی گرنگ ڕابکێشین:

یەکەم: فەلسەفەی ماددی (یان بیرکردنەوەی ماددی) جگە لە چاویلکەیەکی ڕەش هیچی تر نییە؛ کە مرۆڤ دەیکاتە چاوی هەموو شتێ ناشیرین و سامناك دەبینێت..

بەڵام "ڕاستیی ئیمان" چاویلکەیەکی ورشەدار و ڕوون و نوورانییە؛ مرۆڤ بە هۆیەوە هەموو شتێك و هەموو کارێك جوان دەبینێت و بە هاودەمی خۆی دەزانێت.

مرۆڤیش بەپێی بەکارهێنانی هەرکام لەو دوو چاویلکەیە، بارودۆخ و بەدیهێنراوانی دەوروبەری خۆی دەبینێت و هەستیان پێ دەکات!

دووهەم: مرۆڤ بە سروشت بەدیهاتوویەکی کۆمەڵایەتییە و، گەلێ پەیوەندیی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی چەشنی وەرگرتن و، بەخشین و، گوفتار و، پەیوەندی کردن و، هاوسێیەتیی لەگەڵ گشت بوونەوەرانی

دەوروبەریدا هەیە. لەبەر ئەمەیە کە مرۆڤ بووە بە خاوەنی (شەش لایـەن) کـە هەمیشە پەیوەندی‌یەکانی پێیانەوە بەستراون، کە ئەمانەن: لای ڕاست و چەپ (واتە ڕابوردوو و داهاتوو) پشت و پێش (واتە سەرەتا و ئەنجام) سـەر و خـوار (واتە ئاسمان و زەوی).

**❐ لای ڕاست کە "ڕابوردوو"ە**

چاویلکە ماددی‌یەکە وامان پیشان دەدات کە هەموو نشینگەکانی پێشـین ڕووخاون و، باب و باپیرانیش لە "بوون"دا نەماون و تێکڕا بە فەنادا چوون. بەم چاویلکەیە جگە لە تاریکیی چڕوپڕ و سامناك هیچـی تـر لـەم لایەنە بـەدی ناکەیت و، وەك دیمەنی گۆڕستانێکی گەورە و بەرین و داڕوخاو دەیخاتە پێـش چاوت.

بێ گومـان مـرۆڤ بـەم جۆرە ڕوانینـە، دووچـاری نائومێدی و گرفتـاری ترسێکی هەمیشەیی دەبێت.

بەڵام کاتێ نووری ئیمان دێت و دەبێت بە هاودەمی مرۆڤ، ئەو تاریکاییە سامناکە دەڕەوێنێتەوە و دەڵێ:

بەڵێ ڕاستە نشینگە ئاوەدانـەکانی پێشـوو، ڕووخـاون و لـە "بـوون"دا نـەماون، بـەڵام بێ هیـچ زیـانێکی گیـانی! چونکە لـە ڕاستیدا دانیشـتووان و کارمەندانیان بـۆ جیـهانێکی ڕوونـاك و هەمیشـەیی یـەکجار جـوان و ڕەنگـین گوێزراونەتەوە.

ئەم گۆڕانەش کە لەم لاو لـەولا دەیـانبینن و بـە هـەموو جێ‌یەکی جیـهاندا بڵاوبوونەتەوە، لە ڕاستیدا، چەند تونێل و ڕێگایەکن لە نـاو زەویـدا، پیایـاندا گوزەر دەکەین تـاکو بەو جیهـانە فراوانە شـاد و بەهرەمەند ببین.

ئا لەم ئیمانەوە، خۆشی و شادی و حەوانەوە و دڵنیایی - کە هەر یەکیان نیعمـەتێکی گـەورەن - بـەرەو دەروونـی مـرۆڤ دەکشێن و، ئاسـوودەیی پـێ

دەبەخشن و، هانی دەدەن کە لەبەر خۆیەوە هەزاران جار (الحمد لله.. الحمد لله) دووپات بکاتەوە.

❑ **لای چەپ، واتە "داهاتوو":**

بە گوێرەی بینینی ماددی، ئەم لایە بە "مردن" و چاڵی تاریك و سامناکی "گۆڕ" کۆتایی پێ دێت، کە چاڵێکە دەمی کردووەتەوە بۆ ئەوەی قووتمان بدات. ئنجا چەندین دووپشك و ماریش لەوێ ئامادە و چاوەڕوانن، تاکو تەرمی جەستەمان بخۆن و دامانبڕزێنن.

ئەمە ڕوانینی ئەو کەسەیە کە لە نیعمەتی ئیمان بێ بەشە. چەندە ڕوانینێکی ناشیرین و بێزلێکراوە؟!

بەڵام ئەو داهاتووەی کە لای ئیماندار بە نووری ئیمان ڕووناك بووەتەوە، بریتی‌یە لە چەندین باخچەی ڕازاوەی ئامادە کراو و میوانداریی میهرەبانی درێژخایەن، کە بەتامترینی خۆراکە جۆراوجۆرەکان و خۆشترینی هەموو چەشنە خواردنەوە خاوێن و بە نرخەکانی تێدایە و، خوای گەورەی بەدیهێنەری میهرەبان بە چاکە و بەخششی خۆی بۆ مرۆڤی ئامادە کردووە.

ئەم ڕوانینە، هانمان دەدات کە بە هەزاران جار "الحمد لله" لەسەر "نیعمەتی ئیمان" دووپات بکەینەوە.

❑ **لای سەرەوە "ئاسمان":**

وا دابنێ یەکێك بە چاویلکە ڕەشبینەکەی ماددی‌یان بۆی دەڕوانێت. دەبینێت:

ئاسمانێکە ملیۆنەها ئەستێرە و هەسارەی تێدایە؛ لە بۆشاییەکی بەریندا مەلە دەکەن و، بە خێراییەکی یەکجار زۆر، دێن و دەڕۆن و، دارای چەندەها بزووتن و جموجووڵی جۆراوجۆرن، بەڵام بێ هیچ ئامانج و مەبەستێك! بێ هیچ ڕێکخەر و کارسازێك! وەك گومان دەبەن.

ئەمەش بیر کردنەوە و ڕوانینێکە ترس و بیم دەهاوێتە ناو دڵی مرۆڤەوە و، کارێ دەکات بە بینینی سامی لێ بنیشێت و، هیچ هاودەمی و خۆشویستنێکی تێدا بەدی ناکات. بەڵام ئەو چرا گەش و هەڵواسراوانەی کە بە ئاسمانەوەن و، بە زەردەخەنەوە بۆمان دەڕوانن و، بە خێراییەکی جوان و ڕێکوپێك لە خولگەکانیاندا دێن و دەڕۆن، ڕوانینی ئیمانی‌یانە هەموویان دەخاتە ژێر چاودێری و کارسازیی کەسێکی زانای دانا. ئەم ڕووانینەش هاودەمی و خۆشەویستی دەهاوێتە دڵی ئەو ئیماندارەوە، لەبری ئەو سام و بیمەی کە ڕوانینی پێشوو دەبخستە دڵی بابای ماددی‌یەوە.

کەواتە، ئەگەر هەزاران جار بە وتنی: "الحمد لله" سوپاسمان پێشکەشی خوای گەورە بکەین، هێشتا سوپاسگوزاریی کەممان نواندووە لە بەرامبەر نیعمەتی ئیمانەوە کە ئاسمانی لە سەر ئەم شێوە شادی بەخشە پیشان داین.

❑ **لای خوارەوە، واتە "زەوی":**

ئەو کەسەی بە چاویلکە و بۆچوونی ماددی‌یەکان سەیری زەوی دەکات، گۆی زەوی بە زادەی دەستی "ڕێکەوت" دەبینێت و، لای وایە بەری بۆ بەرەڵا کراوە و، هەڵسووڕان و کاروباریشی نە لە دەستی خۆیدایە و نە لە دەستی هیچ کەسێکدا..

هەروەها لای وا دەبێت کە بە هەڕەمەکی و بێ هیچ مەبەست و ئامانجێك بە دەوری خۆردا دەسووڕێتەوە و، چەشنی کەشتی‌یەکی ڕێ لێ ونبووی بێ کەشتیوان وایە لە ناوەڕاستی دەریادا.. ئەو کەسە کە زەوی بەم جۆرە دەبینێت، دووچاری سەرسامی و وڕی و شڵەژاوی دەبێت و، هیچ شتێ تێناگات..

ئا لەم کاتەدا نووری ئیمان بە چەشنی چرا دێت و، بە ڕووناکی‌یەکەی خۆی سەرسامی و شڵەژاویی ئەو مرۆڤە ناهێڵێت و، گۆی زەوی دەکات بە

کەشتی‌یەکی پەروەردگاری‌یانەی گوێڕایەڵ و پڕ لە چەندین جۆری تام و لەزەت و خۆراکی خۆش، کە خوای گەورە بۆ مرۆڤ و زیندەوەرانی تر ڕام و گوێڕایەڵی کردووە، بۆ ئەوەی مرۆڤ بڕواتە سەر پشتی و، خواوەندی گەورەش بەناو هەموو شوێن و لا و جێگاکانی ولاتەکەی خۆیدا بیگێڕێت و، گەشتوگوزاری پێ بکات.

پاشان.. ئایا ئەم نیعمەتەی کە لە ئیمانەوە پەیدا بووە و سەرچاوەی گرتووە، ئیماندار هان نادات کە هەمیشە "الحمد لله" دووپات بکاتەوە؟!

**☐ لای پێشەوە، واتە "ئەنجام و دواڕۆژ":**

مرۆڤی ماددی وا دەبینێت کە هەموو زیندەوەران، چ مرۆڤ و چ ئاژەڵ، تێکڕا بە خێرایی و کاروان لە دوای کاروان بەرەو ئەو ئەنجام و پاشە ڕۆژە دەڕۆن، تاکو هەموو، بێ گەڕانەوە، لە پشت تاریکایی نەبوون و نەمانەوە ئاوا دەبن. بە دڵنیایی ئەوەش دەزانێت کە ڕۆژێك دێت خۆیشی بەرەو ئەو ئەنجامە دەڕوات و، یەکێکە لە بەشدارانی ئەو کۆچە ناکامە. ئەم بیرکردنەوەیەشی لەگەڵدا دەمێنێت تاکو گرفتاری پەژارە و شلەژاوی و وڕێنەی دەکات.

بەڵام ئیمانداری دڵنیا، دەبینێت کە ئەو گەشتە بە "نەبوون" و "نەمان" کۆتایی پێ نایەت و، مرۆڤایەتیش وەك دەشتەکی‌یە کۆچەری‌یەکان وان؛ لەم سەوزایی بۆ ئەو سەوزایی و، لەم خانەی فەنا و نەمانەوە بۆ ئەو خانەی مانەوە و نەمری و، لەم شوێنی کار و خزمەتگوزاری‌یەوە بۆ شوێنی پاداشت وەرگرتن و، لە مەیدانی ئەرك و ئازارەوە بۆ پلەی میهر و پاداشتدانەوە، دەگوێزرێنەوە..

ئیتر ئیماندار بەوپەڕی دڵنیایی و ئومێدەوە بۆ ئەنجام و پاشەڕۆژی خۆی دەڕوانێت و، هەرچی ئەرك وئازار و ماندووبوونی وەك: "مردن و گۆڕ و هاوچەشنیان" لەم ڕێیەدا هەن لای ئیماندار دەبن بە بەختەوەری و لەزەت و

ئاسایش و دڵنیایی. چونکە گومانی لەوەدا نی‌یە کە ئەو ڕێیەی مرۆڤ بە جیهانی ڕووناکی دەگەیەنێت، بە گۆڕدا تێپەڕ دەبێت و لەوێوە گوزەر دەکات..

هەروەها دەشزانێت کە بەختەوەری‌یە مەزنەکان ئەنجامی گیروگرفتە مەزن و ئازار بەخشەکانن. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە حەزرەتی یووسف - دروودی خوای لەسەر بێت - هەتا براکانی هەڵیان نەدایە ناو بیرەوە و، پاشتریش بە بوختان و پیلانی هاوسەری عەزیزی میسر بەند نەکرا، پلەی "عەزیزی میسر"ی بۆ نەڕەخسا. هەروەها مرۆڤ هەتا تەنگانە و ژانی لەدایکبوون نەبینێت، بەختەوەریی ژیانی دەست ناکەوێت.

کەواتە بە هەمیشە و بەردەوامی "الحمد لله" دەڵێین و دووپاتی دەکەینەوە لەسەر ئەوەی کە "نووری ئیمان" هەموو دەرگاکانی بەختەوەریی بۆ خستووینەتە سەر پشت.

**❑ لای پشتەوە "سەرەتا":**

بابای ماددی دەپرسێ:

ئایا ئەم نەوە و وەچە زۆر و هەمیشە زیادبووانە و، ئەم زیندەوەرانە چین؟ لە کوێوە هاتوون؟ بۆ کوێ دەڕۆن؟ بۆچی؟

جا لەبەر ئەوەی "بێ ئاگایی" بە تەواوی هەر شەشدەری لەو گرتووە، ئەوا ناتوانێت وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە. لەبەر ئەوە، لە سەرسامی و دوودڵیدا دەمێنێتەوە، پاشان ئەم سەرسامی و دوو دڵی‌یەشی دەبن بە تاریکی‌یەکی وەها کە دڵ و گیانی ئەم مرۆڤە دادەپۆشن، ئنجا بە توندی هەست بە شڵەژان و ترس و بیمێکی بەردەوام دەکات..

کەچی ئیماندار بەهۆی نووری نیعمەتی ئیمانەوە دەبینێت کە ئەو لایە سەرەتای دروستبوونی مرۆڤە و، خواوەند لەوێوە ناردوویەتی و، لەم خانەی

تاقیکردنەوەیەی دنیادا کـار و ئـەرکێکی پێ سپاردووە. بۆ ئـەوەش ڕەوانـەی کـردووە تـاکو لایەنـە سەرسـووڕهێنەر و ناوازەکـانی موعجـیزاتی توانسـتی پەروەردگار ببینێت کە لـە پیشانگای گەردووندا پێش چاوی خستوون. ئنجـا پاش تەواو بوونی ئەم جیهانە هەر ئەم خواوەندە مـرۆڤ بۆ جیهانی خـەڵات و پاداشتدانەوەی خۆی دەنێرێت، کە لەوێدا هەموو مرۆڤێك بە ئـەندازەی فـام و تێگەیشتنی لـە خوێندنەوە و موتاڵا کردنی کتێبی گەردوون، لـە مـاوەی ژیـانی سەرزەوییدا و، ڕادەی ئەنجامدانی کار و ئەرکـە دیاریکراوەکانی سەرشـانی، پاداشت دەدرێتەوە.

چەندە ئیمـان بەنرخـە! کـە چـەندین نیعمـەتی لەژمارەبەدەری ئاوامـان پێ دەبەخشێت. ئەمـەش هـانی مـرۆڤ دەدات کـە لەسـەر نیعمـەتی ئیمـان، بگـرە هـەموو نیعمەتـەکانی تریش، بـە هەمیشـە و بـەردەوامی "الحمـد لله" دووپـات بکاتەوە.

* * *

لە ڕوانگەی ئەم ڕاستییەوە و، بەم جۆرە بـیرکردنەوە ئیمانییانە، "الحمـد لله" کـردن لەسـەر نیعمـەتی ئیمـان، کـە تـاریکیی هـەر شـەش لاکـانی بـۆ ڕەواندینـەوە، خۆیشـی نیعمـەتێکی مـەزنی دیکەیـە و داخـوازی "الحمـد لله"ی ترە! چونکە تەنها بە "الحمـد لله" کـردن مـرۆڤ لـە پلـە و مـەقامی ئەم نیعمەتـە تێدەگات..

کەواتە:

"الحمد لله" لەسـەر "الحمـد لله" بـە زنجیرەیـەکی بێ کۆتـایی پێکـهاتوو لـە: "الحمد لله رب العالمین"!

● **خاڵی دووهەم:**

ئێمەی ئیماندار پێویستە سوپاسگوزاری بۆ خوای گەورە پێشکەش بکەین لە سەر نیعمەتی ئەو ئیمانەی کە هەر شەش لاکانی بۆ ڕووناك کردینەوە.

جا هەروەك بە لابردنی تاریکاییەکانی ئەو لایانە و، لە ڕووی "دوور خستنەوەی بەڵاکانەوە" ئیمان بە نیعمەتێکی مەزن دادەنرێت..

بە هەمان جۆر، لە ڕووی "گەیاندن و بەخشینی سوودەکانیشەوە" نیعمەتێکی مەزنی ترە، چونکە ئەو لایانەی ڕووناك کردەوە.

هەروەها مرۆڤ سوودێکی تر لە نیعمەتی ئیمان وەردەگرێت، چونکە مرۆڤ پەیوەندیی بە هەموو بەدیهێنراوانی گشت جێگایەکی گەردوونەوە هەیە و، لەم ڕووەوە ئەم ئایەتە پیرۆزەی کە هەموو شوێنێکی گەردوونی بە زایەڵەی زوڵاڵی خۆی پڕ کردووە: ﴿فأينما تولوا فثمَّ وجهُ الله﴾ (البقرة:١١٥) دێت و هەموو شوێن و لایەك بۆ ئیمانداری ڕێز لێگیراو ڕووناك دەکاتەوە. چونکە ئیماندار ڕوو لە هەر لایەك بکات ڕووناکیی ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕووبەڕووی دەبێتەوە، بە ڕادەیەکی وا کە دەڵێی ئیماندار خاوەنی تەمەنێکی مەعنەویی ئەوتۆیە هەر لە سەرەتای دروستکردنی بەدیهێنراوانەوە تا کۆتایی جیهان، بەردەوامە. چونکە سەرەتای ئەو تەمەنە بەفەڕ و بەپیت و پیرۆزە، لە ڕووناکیی ژیان و پەیوەندی بوونەوەیە بە کاروانی ئیماندارانەوە، کە ئەویش لە یەکەم موسڵمانی سەر ڕووی زەوییەوە دەستی پێکردووە.

بەم چەشنە، ئەم نوورەی ئیمان، جیهانە تەسکە قەتیس بووەکەی نێوان سنووری "کات" و "شوێن" دەگۆڕێت بە جیهانێکی حەوێنەری بەرفراوان و، گشت کاتەکانیش، بە ڕابوردوو و ئایندەیانەوە، لە دڵ و گیانی ئیمانداردا دەکات بە کاتی ئێستای، چونکە دووریەکانی نێوان ئەو کاتانە لا دەبات. بەم پێیە، ئەو جیهانە فراوانە دەبێت بە خانە و لانە و نشینگەی ئیماندار.

● خاڵی سێهەم:

"الحمد لله" کردن لە سەر نیعمەتی ئیمان پێویستە. چونکە ئیمان دوو خاڵی گرنگی تێدایە کە بریتین لە خاڵی (پشت پێ بەستن) و خاڵی (یارمەتی لێ وەرگرتن).

بەڵێ، لە بەرئەوەی مرۆڤ.. یەکەم: تابلێی دوژمنی زۆرە و، دووهەمیش: تابلێی کۆڵەوار و دەستەپاچەیە، ئەوا ئەوپەڕی پێویستی بە (خاڵێکی پشت پێ بەستن) هەیە، تاکو بۆ دوورخستنەوەی شەڕ و ئاژاوەی دوژمنە زۆرەکانی هەمیشە هانای بۆ بیات.

ئنجا لە بەر ئەوەش کە پێداویستی و ئاواتەکانی یەکجار زۆرن و، هەتا بیشلێی هەژار و دەستکورتە، ئەوا دەبێ (خاڵێکی یارمەتی وەرگرتن)ی هەبێت، تاکو ئەو پێداویستییانەی بۆ مسۆگەر و هێنانەدیی ئاواتەکانیشی بۆ دابین بکات.

دەسا کاکی مرۆڤ!

بزانە کە "خاڵی پشت پێ بەستن"ت لە کار و کۆششتدا، تەنها "باوەڕ بوونتە بە خوای تاك و تەنیا".. "خاڵی یارمەتیدانی" گیان و دەروونیشت "باوەڕ بوونتە بە ڕۆژی دوایی ".

هەر کەسێ لەم دوو خاڵە بێ بەش بێت، بێ هیچ گومانێك، لە دڵ و گیانی خۆیدا هەست بە بێزاری دەکات و تروسکاییان تێدا شك نابات، دەروونیشی هەمیشە ئەشکەنجەی دەدات و بە سۆی ئازاری سەختەوە دەیتلێنێتەوە..

بەڵام ئەو کەسەی کە پاڵ بە "ئیمان بە خوا" بداتەوە و، لە دووهەمیش "ئیمان بە دوارۆژ" یارمەتی وەربگرێت، بێ هیچ گومانێك، لە قووڵایی و ناخی دڵ و گیانیدا هەست بە چەندین چێژ و لەزەتی مەعنەوی دەکات و،

هـاودەمی(أُنـس)یـەکی دڵنیـایی بـەخش - بـە تـەواوی - ئـەو دڵ و گیانـە دەحەوێنـێتەوە، بە چەشـنێ کە دەروونـی پێ دڵنیـا دەبێـت و دڵیشـی بـە شادمانی و بەختەوەریەکی ئەوتۆ دەگەشێتەوە کە جگە لە خـۆی کـەس پێی نازانێت، تەنانەت بە خەیاڵیشدا نایەت.

● خاڵی چوارەم:

بەرێك بە درەختەکەی نـەزانرێت، تامەکەی تەنـها لـەو بەرەدایە، چونکە هەر تەنها بە خواردنی، لەزەتەکەشی تەواو دەبێت و تـامی نـامێنێت و، خەم و پەژارە دوای خۆی بەجێ دەهێڵێت. بەڵام ئەگەر درەختەکەی بزانرێـت، ئـەوا ئازار و پەژارەی پاش خواردن و نەمان ڕوونادات، چونکە ئەسڵ و بناغەیەکی پێزانراوی هەیە کە لە پاش ئەو بەری تر بەرهەم دەهێنێت!

"نووری ئیمـان"یـش هـەموو ئـەو ئازارانە نـاهێڵێت کـە هـی نـەمانی تـام و لەزەتە حەڵاڵەکانن، چونکە ئیمان هاووێنەی ئەو لەزەتانەی پیشـان دەدات و، دڵنیای دەکات کە لە گەنجینەی میهرەبانیی خواوەنـدەوە هـی تـری بۆ ڕەوانـە دەکرێت..

"ئیمان" بەردەوامیی نیعمـەت و کـەم نەبوونـەوەی، بۆ ئیمـاندار مسۆگەر دەکـات، بـەوەی کـە سـەرچاوەی گەنجینـە پـەروەردگاریـەکانی گشـت نیعمەتەکانی پیشان دەدات..

"ئیمان" بە پیشاندانی لەزەتی تازە بوونەوەی هاوچەشنی تام و لـەزەتەکانی پێشـوو، ئازاری جودایی و لێکدابڕان لـە دەروونـی ئیمـانداردا لا دەبـات. چونکە تەنـها بیر کردنەوە لـە نـەمانی تـام و لــەزەت، چـەندین ئـازاری زۆر دەرخواردی دەروونی مرۆڤ دەدات، تەنها بـە "نـووری ئیمـان" ئـەو ئازارانـە دەتوێنـەوە و، تـەواو بوونیشـیان دەبێـت بـە مایـەی دەسـتکەوتنی چـەندین بەروبوومی نوێی بێ کۆتایی.

تەنگانەترین و خەمناکترینی حاڵەتەکانی گیانی مرۆڤ ئەوانەن کە لە ئازاری جودایی و حەسرەت و پەژارەی لێکدابڕانەوە دووچاری دەبن..

خوای گەورەش کاریگەری‌یەکی وەهای هاویشتووەتە ناو "نووری ئیمان"ەوە کە ئەو ئازارانە نەهێڵێت و، بەردەوامیی تازەبوونەوەی هاووێنە و، بە یەك گەیشتنەوەی، پیشان دەدات..

گومانیش لەوەدا نی‌یە کە تام ولەزەتی نویٚ لە نویٚ بوونەوەی لەزەتدا هەیە و، نویٚ بوونەوە - لە خۆیدا - لەزەتێکە بۆ خۆی و، هەموو شتێکی نوێیش لەزەتێکی نوێی هەیە.

● خاڵی پێنجەم:

ئەو شتانەی کە مرۆڤ لە دەوروبەردا دەیانبینێت و بە وەهمی خۆی وەکو "دوژمن" و "مردوو"ی بێ گیانیان دادەنێت، ئیمان بە خۆشەویست و، برا و، زیندوو و، هاودەم و، بەندەی تەسبیحات گوزار و زیکرخوێنی خواوەند پیشانیان دەدات!

چونکە مرۆڤی بێ ئاگا کە سەیری بوونەوەرانی جیهان دەکات بە دوژمنیان دەبینێت و، هەمیشە لە مشتومڕدایە لە گەڵیاندا و، لە هەموو شتێك بێزارە و، هەر کە ئاوڕ دەداتەوە خۆی لە نێوان چەندین شتی نامۆی وادا دەبینێتەوە کە دەروونیان لە دوژمنایەتیی ئەم پڕ بووە و نیازی خراپیان لە دڵدایە بەرامبەری..

چونکە لە ڕوانگەی گومڕایانەوە پەیوەندیی برایەتی لە نێوان کاتەکانی "ڕابوردوو" و "ئایندە"دا پچڕاوە و، ئەو برایەتی یە - بە لای ئەوانەوە - تەنها لە کاتێکی کەم و سنوورداری ئێستادایە، خۆ ئەگەر برایەتییان زۆر بخایەنێت هەر تەنها وەکو چەند خولەکێکی دیاریکراوە.

بەڵام برایەتیی ئیمانداران ئەوەندە درێژخایەنە کە هەر لە سەرەتای ڕابوردووەوە دەگرێتەوە، تا دەگاتە کۆتایی داهاتوو.

لە کاتێکدا گومڕایی و شوێنکەوتووانی، "بوونەوەران" بە مردووی سامناك دەبینن، ئیمان و ئیمانداران بە چەند بەدیهاتوویەکی خاوەن گیان و ژیانیان دەبینن و، چەشنی هاوەڵ و هاودەم دڵیان پێیان دەکرێتەوە و، بە زمانی خۆشەویستی و ئیمان و فیترەت مامەڵە لەگەڵ یەکتردا دەکەن. چونکە "هەریەك لەو بوونەوەرانە - وەك ئایەتی پیرۆز ئاماژەی بۆ دەکات - نوێژ و تەسبیحاتی خۆی دەزانێت"[1] و، "هیچ شتێك نی‌یە کە تەسبیحات و سوپاسگوزاریی خوا نەکات"[2]. هەموو شتێك بەپێی خۆی و بە گوێرەی توانای، دارای ژیانێکی تایبەتی‌یە.

کەواتە سام و ترس و بیم ناتوانن جێی خۆیان لە بەردەم ڕوانینی ئیماندا بکەنەوە.

کاتێ "گومڕایی" سەرجەمی "زیندەوەران" و "بەدیهێنراوانی بوونەوەر" بە لاواز و کۆڵەوار دەبینێت و، وا دادەنێت کە بە ئاواتەکانیان ناگەن و، کەسێك نی‌یە بیانپارێزێت و، خۆی لە لایان خۆشەویست بکات و، خاوەنێکی دڵسۆزیان نی‌یە سەرپەرشتیکاریان بێت، بەڵکو هەموویان لەناو کۆڵەواری و پەژارە و نائومێدی، چەشنی هەتیو فرمێسك هەڵدەڕێژن..

ئا لەم کاتەدا "نووری ئیمان" دێت و، هەموو بوونەوەرە بێ گیانەکانیش وەك گیاندار و هاوڕاز و هاودەم پیشانی مرۆڤ دەدات.. ئەو شتانەی کە خوای گەورە بەهرەی "بوون" و "ژیان"ی پێ بەخشیون، بە هەتیوی دڵ

(١) ﴿كُلٌّ قد عَلِمَ صلاتَه وتسبيحَه﴾ (النور ٤٨).

(٢) ﴿وإنْ مِنْ شيءٍ إلاّ يُسبِّحُ بحمدِهِ﴾ (الاسراء ٤٤).

شکاوی چاو بەفرمێسکیان نابینێت، بەڵکو بە چەند بەندەیەکی کار پێ سپێرراوی فەرمانبەری دەم بە زیکر و تەسبیحاتگوزاری خوایان دەزانێت.

● خاڵی شەشەم:

نووری ئیمان "دنیا و قیامەت" وەك دوو سفرەی ڕاخراوی پڕ لە جۆرەکانی نیعمەت پیشان دەدات، کە ئیماندار بە دەستی ئیمان و هەستە ئاشکرا و پەنهان و لایەنە ناسکە مەعنەوی و گیانییەکانی سوودیان لێ وەردەگرێت و لێیان بەهرەمەند دەبێت..

بەڵام لە ڕوانگەی گومڕاییەوە، سوود وەرگرتنی زیندەوەران لەم دوو سفرەیە ئەوەندە بچووك دەبێتەوە کە تەنها لە بازنەی تام و چێژە ماددییەکاندا دەمێنێتەوە. کە دیارە ئەمانەش کۆتاییان پێ دێت و نامێنن. ئەم نەمانەشیان تامی ئەو لەزەتانە تاڵ و لێڵ دەکات.

کەچی نووری ئیمان بازنەی ئەو سوود وەرگرتنە ئەوەندە فراوان دەکات کە دەورەی ئاسمان و زەوی، بگرە دنیا و قیامەت دەدات. بە ڕادەیەك کە ئیماندار "خۆر" وەك چرایەك دەبینێت و "مانگ"یش بە ڕووناکیی خانووەکەی دادەنێت و، ئەم دوانە سەبارەت بەو دەبن بە نیعمەت و، بە دوو هاوڕێی کار و هاودەمی سەفەریان دادەنێت.

بێ گومان بازنەی ئەو نیعمەتانەی کە بە مرۆڤ بەخشراون گەلێ فراوانترە لە بیرکردنەوە و بۆچوونی ئێمە. چونکە قورئانی پیرۆزی خاوەن ئیعجاز دەفەرموێ:

﴿وسَخَّرَ لكم الشمسَ والقمر﴾ (ابراهيم:٣٣)..

هەروەها دەفەرموێ:

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللهَ سخَّرَ لكم ما في الأرضِ والفلكَ تجري في البحرِ بأمره﴾(الحج:٦٥).

قورئانی پیرۆز لەم چەشنە ئایەتانەدا بە ڕەوانبێژییە ڕەنگینەکەی خۆی ئاماژەی بۆ ئەم جۆرە چاکەکارییە دەراسایانە کردووە، کە لە ئیمانەوە پەیدا دەبن.

● خاڵی حەوتەم:

ئیماندار بە نووری ئیمانەکەی دەزانێت کە گەورەترین نیعمەت لە بووندا "ناسینی خوایە". چونکە هیچ نیعمەتێکی تر لە سەروویەوە نییە و، سەرچاوەی هەموو جۆرەکانی تری نیعمەتە بێ کۆتاییەکان و چاکەکارییە بەردەوامەکان و چەشنەکانی بەخششە بێ سنوورەکانی خواوەندە..

کەواتە بە ئەندازەی گەردیلەکانی جیهان پێویست دەکات "الحمد لله" لە سەر ئەم نیعمەتانەی ئیمان بکەین. چونکە "أل" ی "ئیستیغراق" ی "الحمد" هەموو ئەو نیعمەتانە دەگرێتەوە کە داخوازی سوپاس لەسەر کردنن.

یەکێ لەو نیعمەتانە ئەوەیە کە خوا "ڕەحمان"ە. ئەمەش ئەوەندە نیعمەتی تێدایە بە ئەندازەی ژمارەی هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندییان بە سۆز و بەزەیی هاتنەوەوە هەیە بە زیندەوەراندا. چونکە مرۆڤ پەیوەندیی بە هەموو زیندەوەرانەوە هەیە و، بە سروشتیش وا بەدیهێنراوە کە بە بەختەوەریی ئەوان ئەم بەختەوەر دەبێت و، بە ئازاریشیان ئازار دەچێژێت. کەواتە نیعمەتێك بۆ یەك کەس، لە ڕاستیدا نیعمەتە بۆ هەموو خەڵکی بە گشتی..

یەکێکی تر لەوانە ئەو نیعمەتەیە کە خوا "ڕەحیم"ە. ئەمەش نیعمەتێکی هێندە فراوانە کە بە ئەندازەی ژمارەی ئەو منداڵانەی وان لە ژێر سایەی نیعمەتی سۆزی دایکانیاندا، نیعمەتی گرتووەتەخۆ و هەر هەموویان داخوازی سوپاس و ستایشن.

بەڵێ، هەر کەسێك دارای سروشتێکی ساغ بێت، گریانی منداڵی هەتیو کاری تێدەکات و ئازاری دەدات، هەر ئەو کەسە تامی ئەو میهرەبانی و

سۆزەش دەچێژێت کە دایکان لە ڕووی جگەرگۆشەکانیاندا دەینوێنن. ئەم تام و چێژانەش نیعمەتێکی مەزنن و داخوازی شوکر و ستایشن..

یەکێکی تر لەوانە ئەو نیعمەتەیە کە خواوەند "حکیم" واتا دانایە. ئەمەش نیعمەتێکی ئەوتۆیە کە بە ئەندازەی ژمارەی تاك تاك و جۆرەکانی بوونی "دانایی" لە ناو هەموو بوونەوەران و تێکڕای گەردووندا، داخوازی سوپاس و شوکرانەبژێرییە. چونکە هەروەك "دەروونی مرۆڤ" نیعمەتی نووره "ڕەحمانییەکان" و "دڵ"یشی هی درەوشانەوە "ڕەحیمییەکان" دەچێژن، "ژیری"یش بە هەمان جۆر تامی لایەنە ناسکەکانی "دانایی" خواوەند دەچێژێت.

کەواتە پڕ بە دەم و دڵ و دەروون و ژیری، سوپاس بۆ خوای گەورەی میهرەبانی دانا.

هەروەها سوپاسێکی ئەوەندە زۆر پێشکەشی خوای گەورە دەکەین کە زایەڵەکەی بۆشایی ئاسمان پڕ بکات، لەسەر نیعمەتی ئەوەی کە ئەو خوایە "حفیظ" واتا: پارێزەرە. چونکە "بەردەوامیی نیعمەت" گەلێ لە خودی نیعمەتەکە مەزنترە و "مانەوەی لەزەت" گەلێ لە تام و لەزەت بەلەزەتترە و "مانەوەی هەمیشەیی ناو بەهەشت"یش نیعمەتێکە زۆر لە بەهەشت - خۆی - بەرزترە.

جا نیعمەتی ئەوەی کە بزانین خواوەند "پارێزەر"ە، چەندین نیعمەتی زۆر و زیاتری لە هەموو جۆرەکانی نیعمەتی ناو بوونەوەری لە دوو توێدایە.

هەر بەم چەشنە، بۆ خۆت ناوە جوانەکانی تری خوای گەورە لەگەڵ ئەم ناوانەی "الرحمن و الرحیم و الحکیم و الحفیظ"دا قیاس بکە، چونکە هەریەك لە ناوەکانی خوای گەورە چەندین نیعمەتی لەژمارەبەدەریان تێدایە، داخوازی سوپاسگوزاریی بەردەوامی بێ کۆتایین.

یەکێکی تر لەو نیعمەتانە، نیعمەتی "ئیسلام" و "قورئانی پیرۆز" ە کە سەرچاوەی هەموو نیعمەتە ماددی و مەعنەوی‌یەکانیان بۆ تەقاندینەوە. خۆ دیارە ئەمەش داخوازی سوپاسگوزاری‌یەکی نەبڕاوە و هەمیشەییە.

یەکێکی تر لەو نیعمەتانە "حەزرەتی محەممەد"ە ﷺ کە دەبێ شوکرانە و سوپاسگوزاری‌یەکی بێ کۆتایی پێشکەش بە خوای گەورە بکەین لەسەر ئەوەی کە ئەم پێغەمبەرە ئازیزەی ﷺ بۆ ناردین. چونکە تەنها ئەو بوو بە هۆی دەستکەوتنی نیعمەتی ئیمان و، کردنەوەی دەرگای گەنجینەکانی هەموو نیعمەتەکانی تر..

کەواتە ئەم پێغەمبەرە ﷺ نیعمەتێکە گشت مرۆڤایەتی قەرزاری سوپاس و ستایشی هەتاهەتایی ئەون.

● خاڵی هەشتەم:

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خواوەندەی کە:

ئەم کتێبە گەورەیەی "گەردوون" و "قورئانی پیرۆز"ی - کە ڕوونکەرەوەی کتێبی گەردوونە - بە چەشنێ خستووەتە پێش چاو کە بە دەرخستن و پیشاندانی وەسفەکانی جوانی و کەماڵی ئەو، سوپاس و ستایشی خۆیانی پێشکەش دەکەن.

ئەم کتێبەی "گەردوون" بە هەموو باب و فەسڵەکانی و، بە گشت لاپەڕەکانی و، ئەو واتایانەی لە توێی دێڕ و وشە و پیتەکانیدان، هەریەکەیان بە گوێرەی خۆیان و، هەر لە بچووکترین تا گەورەترین نەخشونیگار کە لە ناویاندایە - تێکڕا - سوپاسی خوای گەورە دەکەن و، بە دەرخستن و پیشاندانی وەسفەکانی شکۆمەندیی خواوەندە گۆیا و تاك و تەنیا و صەمەدەکەیان، تەسبیحاتی خۆیانی پێشکەش دەکەن..

هـەموو پیتێکیشـی، بـە پیشـاندانی نـووری وەسفەکانی جوانیـی نووسـەرە "ڕەحمان و ڕەحیمەکەیان" ستایشی دەکەن..

هەرچی نوختە و نەخشی ناو گەردوونیش هەن، چەند ئاوێنەیەکن تیشـکی ناوەکانی ئەو کەسە دەدەنـەوە و دەری دەخـەن کـە خـاوەنی نـاوە جوانەکانـە، کە خواوەندی شکۆمەندی بێ هاوتا و بێ هاوبەشە.

● خاڵی نۆهەم:

الحمد – من الله بالله على الله – لله، بعدد ضرب الكائنات من أول الدنيا إلى آخر الخلقة، في عاشرات دقائق الأزمنة، من الأزل إلى الأبد.

الحمد لله على نعمة القرآن والإيمان عليَّ وعلى إخواني بعـــدد ضـــرب ذرات وجودي في عاشرات دقائق عمري في الدنيا وبقائي في الآخرة.

﴿سبحانَك لا علمَ لنا إلا ما علّمتَنا إنّكَ أنتَ العليمُ الحكيم﴾.

﴿الحمدُ لله الذي هدانا لهذا وما كنا لنهتدي لولا أن هدانا الله لقد جـاءت رسل ربنا بالحق﴾.

اللهم صل على سيدنا محمد بعدد حسنات أمته، وعلى آلـــه وصحبـــه وسلم. آمين. والحمد لله رب العالمين.

* * *

# تۆی مرۆڤ ملوانكەی هەموو نیعمەتەكانیت!

بزانە كە:

تۆ لە "نەبوون"ەوە هێنراویتە"بوون".. پاشان بەدیهێنەرەكەت لە نزمترین پلەكانی "بوون"ەوە بەرزی كردوویتەوە تا بە چاكە و نیعمەتی خۆی گەیاندوویتە وێنە و شێوەی "مرۆڤی موسڵمان"..

جا هەموو یەكێك لەو مەنزڵگە زۆر و زەبەندانەی كە دەكەونە نێوان سەرەتای هەنگاونانتەوە هەتا ئێستات، هەموویان نیعمەتی خواوەندن بەسەرتەوە و، لە هەموو یەكێكی ئەونیعمەتانەدا "بەر" و "ڕەنگ"ێكت گرتووە، ئیتر وەك ملوانكە و هێشویەكت لێ هاتووە كە بە دەنك و دانەی نیعمەتەكان هۆنراینەوە و، هەر لە تەوقی سەرتەوە هەتا پەنجەكانی پێت وێنەی گوڵەگەنمێكی ڕێكخراو دەنوێنیت، دەڵێی پێڕستێكیت بۆ گشت چینەكانی نیعمەتەكانی خوای گەورە.

جا لەبەر ئەوەی لە لای هەموو ژیرییەكان ئەو بڕیارە چەسپاوە كە:

"بوون" داخوازی بوونی هۆكارێك دەبێت بیهێنێتە بوون، بە پێچەوانەی "نەبوون"ەوە.. ئەوا لە هەموو یەكێكی مەنزڵەكانی پەیدا بوونت ــ هەر لە گەردیلەوە هەتا عەدەم ــ بەرپرسیاریت و، پرسیاریشت لە بارەوە دەكرێت كە:

ئایا چۆن بەم نیعمەتە گەیشتیت و، بەچی شایستەیی ئەوت بە دەست هێنا؟

هەروەها لێت دەپرسرێت کە:

"ئایا شوکرانەت لەسەر پێشکەش کرد"؟

خۆ دیارە کەسێك کە خاوەنی تۆزقالێك ژیری بێت، هەرگیز سەبارەت بە بەردێك ناپرسێت: بۆچی نەبوو بە درەختێك و، لە بارەی درەختێکیشەوە ناپرسێت کە: بۆچی نەبوو بە مرۆڤێك؟!

دەسا ئەی سەعیدی هەژاری لەخۆبایی!

تۆ "خاڵێك"یت لە ناوەندی زنجیرەی بوونەوەراندا. کەواتە بە ئەندازەی ژمارەی پلەکانت، هەر لە پلەکانی خوار خۆتەوە تا دەگاتە "نەبوون"ی تەواوەتی، نیعمەتت پێ دراوە و، لە شوکرانەی هەموویان بەرپرسیت..

بەڵام پلەکانی سەرووی خۆت، نە تۆ و نە هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە کە بپرسێت: (بۆچی نەگەیشتوویتە پلەیەکی بەرزتر لەوەی تیایدایت)؟ بە چەشنی "گەردیلە" کە مافی ئەوەی نییە بڵێت: (ئای.. بۆچی نەبووم بە خۆر)! بە وێنەی "هەنگ"یش کە بۆی نییە بە بەدیهێنەری خۆی بڵێت: (بۆچی لە شێوەی دار خورمایەکی بەرداردا بەدیت نەهێنام)؟!

چونکە پلەکانی خوارەوەی خۆت بریتین لە: "وقووعات". واتە چەند پلەیەکی واقیعین و دارای "بوون"ن..

بەڵام هەرچی ئەو پلانەی سەرەوەی خۆتن "عەدەمات"ن، واتە: چەند شتێکی "نەبوو"ی وەهان کە هەرچەندەش گریمانی بەدەستهێنانی "بوون"یان بۆ دابنرێت، بەڵام لە ڕاستیدا لە چەشنی شتانی "مومتەنیع"ن، کە "بوون"یان پێ نابەخشرێت!

هێمای یەکەم لە مەقامی یەکەمی

مەکتووبی بیست وچوارەم:

# بەدیهێنەری مەزن هەموو بەدیهێنراوێکی کردووە بە نموونە لە سەر توانستی خۆی

لە باسەکانی کۆتایی وتەی بیست و شەشەمدا وتمان:

وەستایەکی پیشەسازی کارامە، بۆ ئەوەی لێهاتن و کارامەیی خۆی لە "پیشە"کەیدا بخاتە ڕوو، مرۆڤێکی کرێکاری هەژار بە کرێیەکی گونجاو دەگرێت، تاکو وەك نموونە(مۆدیل)ێك بیخاتە کار و هەڵی بسووڕێنێت و، بەرگێکی قەشەنگی نایابی لە جوانترین ئارایشت و ڕازاوەیی پێ لەبەر بکات..

بۆ ئەم مەبەستە، تاوێك بەرگەکەی بە درێژی بە بەر دەبڕێت و، تاوێکی تر مقەستی تێدەبات؛ کورتی دەکاتەوە و، هەندێ جاریش بەو بەرگەوە دایدەنیشێنێت و هەندێ جاری تر هەڵی دەستێنێتە سەرپێ.. بەم جۆرە لە چەندین شێوە و بارودۆخی جیاجیادا بەو بەرگانەوە هەڵی دەسووڕێنێت..

جا ئایا ئەم کەسە هەژارەی کە بەرامبەر کرێیەك ئەم کارانەی پێ ئەنجام دەدرێت، مافی ئەوەی هەیە بە وەستا پیشەسازەکە بڵێت:

بۆچی تاوێك دامدەنیشێنیت و، تاوێکی تر هەڵمدەسێنیت و، حەوانەوەم لێ تێکدەدەیت؟! دیارە نەخێر.

خواوەندی دروستکەر و بەدیهێنەری مەزنیش - ولله الْمَثَلُ الأعلى - بە هەمان جۆرە. چونکە ماهییەتی هەموو یەکێك لە جۆرەکانی بوونەوەرانی وەك پێوەر و نموونەیەك بەدی هێناوە و، ئنجا بەرگێکی بە بەری هەموو یەکێکیان بڕیوە کە بە هەستەوەرەکان ئەو بەرگەی ڕازاندووەتەوە و، بە قەڵەمی قەزا و قەدەری خۆی چەندین نەخشونیگاری تێدا کێشاوە و، درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خۆیشی تێدا دەرخستووە..

هەموو ئەوانەش بە مەبەستی پیشاندان و خستنە ڕووی "کەماڵی سنعەتی خۆی" لە ڕێی نەخشونیگاری ناوە جوانەکانیەوە. جگە لەوەی کە ئەو خواوەندە، کەماڵ و لەزەت و بەهرەیەك، بە هەموو یەکێکی ئەو بوونەوەرانە دەبەخشێت و، ئەمانەشیان بۆ دەکات بە کرێ و پاداشتی شیاو بەرامبەر ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی ئەستۆیان.

جا ئایا هیچ کامێکی ئەو بوونەوەرانە مافی ئەوەی هەیە بەو بەدیهێنەرەی خۆی (کە خاوەنی هەموو موڵکێکە و بۆی هەیە هەر چۆنێکی دەوێت لە موڵکی خۆیدا ڕەفتار بکات) بڵێت:

" تۆ ماندووم دەکەیت و حەوانەوەم دەشێوێنیت"؟

نەخێر.. نەخێر!

بوونەوەران - بە هیچ جۆرێك - بۆیان نییە لە بەرامبەر خواوەندی "واجب الوجود"ەوە داوای هیچ مافێك بکەن. بەڵکو دەبێ ئەوان بەرامبەر بە مافی "بەخشینی پلەکانی بوون" کە ئەو خواوەندە پێی بەخشیون، هەمیشە لە شوکرانە و سوپاسگوزاریی بەردەوامدا بن..

چونکە هەموو پلەکانی "بوون" کە بە بوونەوەر بەخشراون، بریتین لە "وقوعات" و پێویستیان بە هۆکارێك دەبێت کە بوونیان پێ ببەخشێت. بەڵام ئەو پلانەی "بوون" کە بە بوونەوەران نەبەخشراون "ئیمکانات"ن. خۆ

ئیمکاناتیش بریتین لە "نەبوون" و، هێندە زۆرن کۆتاییان پێ نایەت. ئنجا عەدەمیش پێویستی بە هۆکارێك نییە هەتا بیکات بە عەدەم، شتی بێ کۆتاییش بە هەمان جۆرە.

بۆ نموونە:

"کانزاکان" مافی ئەوەیان نییە سکاڵا دەرببڕن و بڵێن: بۆچی نەکراین بە ڕووەك؟ بەڵکو مافی ئەو تەنها لەوەدایە سوپاسی بەدیهێنەری مەزنی بکات لەسەر ئەوەی کردوویەتی بە کانزا و، نیعمەتی "بوون"ی پێ بەخشیوە..

هەروەها "ڕووەك" مافی سکاڵای نییە و، ناتوانێت بڵێت: بۆچی نەبووم بە زیندەوەرێکی وەك ئاژەڵ؟ بەڵکو مافی ئەو بریتییە لەوەی کە شوکرانەی ئەو خواوەندە بکات کە "بوون" و "ژیان"ی پێکەوە پێ بەخشیوە..

هەروەها "ئاژەڵ" مافی سکاڵای نییە و، نابێ بڵێت: بۆچی نەکرام بە مرۆڤ؟ بەڵکو مافی ئەو لەوەدایە کە شوکرانە پێشکەشی خوای گەورە بکات لەسەر پێبەخشینی نیعمەتی "بوون" و "ژیان" و "گیان"، ئەو گیانەی کە گەوهەرێکی هەمیشەییە.

هەر بەم پێوەرە بۆ خۆت هەموو شتێکی تر بپێوە و لێکی بدەرەوە.

ئنجا تۆیش ئەی مرۆڤی سکاڵاکەر! بیر بکەرەوە.. تۆ لە "عەدەم"دا نەماویت، بەڵکو نیعمەتی "بوون"ت لەبەر کراوە و تامی "ژیان"یشت پێ چێژراوە. تەنانەت نەکراویت بە بوونەوەرێکی بێ گیان، یاخود زیندەوەرێکی وەك ئاژەڵ! بەڵکو بە "مرۆڤ" دروست کراویت و بە نیعمەتی "ئایینی ئیسلام" بەختەوەر بوویت و، لە تەنگ و تاریکیی گومڕاییدا نەماویتەوە، سەرباری هەموو ئەمانەش بەهرەمەندی نیعمەتەکانی: لەشساغی و.. بێ وەیی و.. هتد... کراویت.

ئەی ئەو کەسەی نوقمی ناشکوری بووە!

ئایا دوای ئەم هەموو نیعمەتانە، هێشتا پێت وایە کە مافت بەسەر خوای گەورەوە هەیە؟

خۆ تۆ شوکرانەی نیعمەتە خاوێن و بێگەردەکانی "پلەکانی بوون"ت تا ئێستا پێشکەش نەکردووە کە خواوەند پێی بەخشیویت..

ئەوەتا دەچیت سکاڵای لە دەست دەکەیت، لەسەر ئەوەی چەند نیعمەتێکی پێ نەداویت لەوانەی کە لە جۆرەکانی "ئیمکانات"ن و، لە ڕاستیدا هەموویان "عەدەم"ن و، توانات بە سەریاندا ناشکێت و، شایانیشیان نییت.. بەم چەشنە، تا دەتوانیت لە هەناسەبڕکێ و هەڵپەی ناڕەوادایت بە دوایاندا و، ناشکوریی نیعمەتەکانیش دەکەیت!

ئایا گەر پیاوێك تا سەر لوتکەی منارەیەکی بەرز پلە پلە سەربخرێت و، لە هەموو پلەیەکیشدا دیارییەکی بەنرخی پێشکەش بکرێت هەتا دەگاتە بەرزترین شوێنی لووتکەی منارەکە.. ئایا مافی ئەوەی هەیە سوپاسی خاوەنی ئەو دیاری و نیعمەتانە نەکات و، هێشتا بەدەم خەم و پەژارەوە بڵێت:

بۆچی توانای سەرکەوتنم پێ نەدرا تاکو لەمەش بەرزتر سەربکەوم؟!

ئایا گەر ڕەفتاری ئاوا بنوێنێت چەندە کارەکەی ناڕەوا دەبێت و، خۆی دەهاوێتە کەندەڵانی "ناشکوریی نیعمەت" و، چەندەش خۆی گرفتاری گومراییەکی بێزلێکراو دەکات!

ئەمە دەرئجامێکە تەنانەت کەسانی گێلیش پەیی پێ دەبەن.

ئەی هەڵپەکاری بێ قەناعەت!

ئەی هەڵەخەرجی دەست پێوەنەگر!

ئەی مرۆڤی بێ ئاگای بە ناحەق سکاڵاکەر!

بەوپەڕی دڵنیاییەوە بزانە کە:

"قەناعەت" شوکرانەیەکی سوودبەخش و بەپیتە و، بە پێچەوانەشەوە "هەڵپەکاری" کافری و ناشکوری‌یەکی زیانبەخشە..

هەروەها بزانە کە "دەستپێوەگرتن" ڕێزنانە لە نیعمەت و، کارێکی بەسوود و جوانە. بەڵام "ئیسراف و هەڵەخەرجی" بێ ڕێزی‌یە و، پێ نەزانینی نیعمەتە و، زیانەدر و بێ کەڵك و ناشیرینە.

جا ئەگەر تۆ مرۆڤێکی ژیریت، ئەوا فەرموو خۆت لەسەر قەناعەت ڕابهێنە و، هەوڵ بدە بگەیتە پلەی "ڕەزامەندی".

خۆ ئەگەر ئەوەشت لە تواناندا نەبوو، ئەوا بڵێ: "یا صبور"!

ئنجا کاڵای ئارامگرتن بە بەرت ببڕە و، بەو مافەی خوای گەورە پێی داویت ڕازی بە و، هەرگیز توخنی سکاڵا مەکەوە و، باش بیر بکەرەوە و، بزانە کە تۆ "لە دەست کێ" و "لە لای کێ" سکاڵا دەکەیت!

کەواتە هەتا دەتوانیت لایەنی بێدەنگی بگرە.

خۆ ئەگەر لەگەڵ ئەمەشدا هەر ناچاری سکاڵا بوویت، ئەوا تەنها سکاڵای "دەروون"ی خۆت بۆ لای خوای گەورە ببە! دڵنیابە هەموو کەموکووڕی‌یەك هەر لەو "دەروون"ەوەیە!

* * *

سەرنجی دووهەمی بریسکەی سیهەم:

## یاسای دادگەری خواوەند داخوازی "دەستپێوەگرتن"ە

دەسا ئەی مرۆڤی هەڵەخەرجی ستەمکار و چەپەڵ!

باش بزانە کە "دەستپێوەگرتن" و "خاوێنی" و "دادگەری" چەند یاسایەکی خوایی ئەوتۆن کە لە سەرانسەری گەردووندا دەست بەکارن و، چەند دەستوورێکی وەهاشن کە سەرجەمی بوونەوەران لە دەوری کۆبوونەتەوە و، جگە لە تۆی بەدبەخت هیچ شتێك نی‌یە ملکەچ نەبێت بۆ ئەو یاسا و دەستوورانە. خۆ تۆیش بەم جیابوونەوەیەت لە بوونەوەران لەوەدا کە بەپێی ئەو یاسا هەمەلایەنگرانە دەڕۆن، خۆت گرفتاری بێز و نەفرەت و ڕقی ئەو بوونەوەرانە دەکەیت و شایانی ئەو دەرەنجامەشیت..

ئایا پشت بە چی دەبەستیت وا ڕقی سەرجەمی بوونەوەران لە دژی خۆت دەورووژێنیت کاتێ کە تاوانی ستەم و هەڵەخەرجی ئەنجام دەدەیت و، گوێ بە هاوسەنگی و پاکوخاوێنی نادەیت؟

بەڵێ، ئەو دانستە گشتی‌یەی کە بەسەر گەردووندا زاڵە و، لە درەوشانەوەی ناوی (العدل)ی خوای گەورەوە سەرچاوەی گرتووە، لە ڕاستیدا هاوسەنگیی هەموو شتان بەڕێوە دەبات و، داوای هێنانەدیی (دادپەروەری) لە مرۆڤ دەکات.

بەڵێ، هەروەك "ئیسراف" لە هیچ شتێکدا نی‌یە، بە هەمان جۆر "ستەمی ڕاستەقینە"ش لە هیچ شتێکدا و "تەرازووبازی"ش هەرگیز لە تەرازووی گەردووندا نی‌یە. لەمەوە بزانە کە حەقیقەت و دەستوورەکانی قورئان وەك: (دادگەری و، دەستپێوەگرتن و، خاوێنی) چەندە بە ناخی ژیانی کۆمەڵایەتیدا ڕۆچوون و، دارای دامەزراوی و ڕەسەنایەتین.

# بە "دەست پێوەگرتن" و "بەرەکەت" دەژیم

**پرسیار:**

ئەهلی دنیا دەپرسن و پێم دەڵێن:

بە چی دەژییت؟ چۆن بە بێ کار و کەسابەت گوزەرانت بۆ هەڵدەسووڕێت؟ ئێمە لە وڵاتەکەماندا جێی ئەو تەمبەڵانە ناکەینەوە کە پاڵیان لێ داوەتەوە و لەسەر حسابی ڕەنج و کۆششی کەسانی تر دەژین؟!

**وەڵام:**

من بە "دەست پێوەگرتن" و "بەرەکەت" دەژیم و، جگە لە خوای ڕۆزیدەرم منەتی هیچ کەسێك هەڵناگرم و، بڕیاریشم داوە لە درێژایی ژیانمدا منەتی کەس هەڵنەگرم.

بەڵێ، ئەو کەسەی کە بە سەد "پارە" بەڵکو بە چل پارە[1] بژی، هەرگیز نایەوێت خۆی بخاتە ژێر منەتی کەسانی ترەوە!

هیچ کاتێك حەزم لە دەرخستنی ئەم مەسەلەیە نەکردووە و ئارەزوومەندی لێدوانی نەبووم، نەبادا وا هەست بکرێت کە لە خۆم بایی بوویێتم و دارای خۆپەرستی بم. چونکە زۆرم پێ ناخۆشە بیدرکێنم و لەسەر "دڵ"م گەلێ قورسە باسی بکەم. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەهلی دنیا گومان و دوودڵی لە دەروونیاندا دروست دەبێت کاتێ ئەم پرسیارەم ئاراستە دەکەن، ئەوا ناچارم کە بڵێم:

---

(١) چل "پارە" دەکاتە یەك "قورش" دە قورشیش دەکاتە یەك لیرەی تورکی! (وەرگێڕ)

- دەستووری سەرانسەری ژیانم بریتی‌یە لە: وەرنەگرتنی هیچ شتێك لە کەسانی تر، هەر لە منالیمەوە هیچ شتێکم لە خەلکی - تەنانەت زەکاتی مالیشیان - وەرنەگرتووە.

پاشان مووچە وەرنەگرتن و دەست نانم بە ڕووی مانگانەی حکومەتەوە، جگە لەوەی کە دەولەت بۆ ماوەی دوو سال بۆی بڕیبوومەوە و هاوڕێیانم گەلێ ڕوویان لێ نام بۆ وەرگرتنی، کاتێ ئەندامی "دار الحكمة الاسـلامية" بووم.. هەروەها ملنەدانم بۆ هەلگرتنی منەتی خەلکی لە هیچ پێداویستی‌یەکی ژیان و گوزەرانمدا..

هەموو ئەمانە، ئەو دەستوورەی ژیانم ڕوون دەکەنەوە. خەلکی شارەکەم و ئەوانەش کە لە شارەکانی تردا لە نزیکەوە دەمناسن، بە باشی ئاگاداری ئەم لایەنەی ژیانمن.

لە ماوەی ئەم پێنج سالەی ڕەهەندەییمدا زۆر کەس لە هاوڕێیان بە چەندین هەولی جۆراوجۆر ویستیان دیاری‌یەکانیان لێ وەربگرم، بەلام دەستم بە ڕووی گشت هەولەکانیانەوە نا.

جا ئەگەر لێرەدا پرسیار بکرێت و بوترێ: کەواتە بەچی دەژییت؟

دەلێم: بە "بەرەکەت" و "ڕێزلێنانی خوایی" دەژیم! چونکە هەرچەندە دەروونی بەدخوازم شایانی هەموو سووکایەتی و نزمایەتی‌یەکە، کەچی لە مەسەلەی "پێ بەخشینی ڕۆزی"دا هەمیشە بەرەکەتم دەستگیر دەبێت، کە ڕێزلێنانێکی خواییە و، وەك کەرامەتێکی خزمەتگوزاریی قورئانی پیرۆز بە خزمەتگوزارەکە دەبەخشرێت.

جا بۆ ئەوەی شوکرانەبژێریی مەعنەوی بەرامبەر بەو نیعمەتانەی خواوەند دەربڕم کە بەهۆیانەوە ڕێزی لێ ناوم و.. بۆ مەبەستی جێبەجێ کردنی فەرمانی ئایەتی: ﴿وأمّا بنعمةِ ربّك فحدّثْ﴾ (الضحى:١١) وا چەند نموونەیەك

لەو بەرەکەت و ڕێزلێنانە خواییانە باس دەکەم، هەرچەندەش دەترسم ئەم شوکرانە مەعنەوی‌یە شتێکی لە "ڕیا" و "غروور" تێکەڵ بێت و ئەو بەرەکەتە خاوێن و پەروەردگارییانە پووچەڵ بکاتەوە و بیانسڕێتەوە. چونکە دەرخستنی بەرەکەتی شاراوە بە شێوەیەك شانازی پێوەکردن بگەیەنێت، دەبێت بەهۆی بڕین و نەمانی! بەڵام چی بکەم؟ ناچارم باسی بکەم:

*یەکەم:* ئەم شەش مانگەی ڕابوردوو، سی و شەش کولێرە سەروزیادم بوون کە لە یەك "کیلە Kile"[(١)] گەنم دروست کرابوون. تا ئێستاش لەو نانە ماوە و، نازانم کەی تەواو دەبێت؟[(٢)]

*دووهەمیان:* لەم مانگە پیرۆزەی ڕەمەزاندا، تەنها لە دوو ماڵەوە خواردنم بۆ هات. کەچی هەردووکیان نەخۆشیان خستم! لەمەوە تێگەیشتم کە خواردەمەنیی کەسانی تر لە من قەدەغەیە! ئنجا یەك "هۆقە"[(٣)] برنج و سێ دانە کولێرە سەروزیادی ڕۆژەکانی تری ڕەمەزانم بوو. هاوڕێی ڕاستگۆ "عەبدوللا چاوش"ی[(٤)] خاوەنی ئەو ماڵە موبارەکەی کە خواردنم تێدا بۆ ئامادە دەکەن، شایەتە لەسەر ئەمە. تەنانەت برنجەکە تا پازدە ڕۆژی دوای ڕەمەزانیش بەشی کردم!

---

(١) کیلە Kile: یەکەیەکی پێوانەی گەنمە و یەکسانە بە (چل لیتر گەنم). (وەرگێڕ)

(٢) یەك ساڵی ڕەبەقی خایاند. (دانەر)

(٣) یەك هۆقەی ئەوێ دەکاتە (١٢٨٢ گرام). بڕوانە فەرهەنگی تورکیی: (Yeni Lugat). (وەرگێڕ)

(٤) "عەبدوللا چاوش" یەکەم پۆستەچیی پەیامەکانی نوورە، ڕەشنووسی پەیامەکانی نووری لە مامۆستا نوورسی وەردەگرت و دوور لە چاودێریی کاربەدەستان بە درێژایی شەو لەناو دۆڵ و چیاکاندا لەم گوندەوە بۆ ئەو گوند دەڕۆیشت تاکو بە دەستی شەهید "حافظ عەلی"ی دەگەیاندن. پاشان پاکنووسەکانی لێ وەردەگرتن و بە هەمان شێوە و لە هەمان ڕێگاوە دەیگەیاندنەوە دەستی مامۆستا نوورسی! ساڵی ١٩٦٠ز لە تەمەنی شەست و پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

*سێهەمیان:* خۆم و میوانە بەڕێزەکانم ماوەی سێ مانگی ڕەبەق لەسەر چیاکە یەك ئۆقیە "کەرە" بەشی کردین، هەرچەندەش ڕۆژانە بە نانەوە لێمان دەخوارد! تا جارێکیان میوانێکی موبارەکم لەلا بوو کە ناوی "سولەیمان"ە، لەو دەمەشدا نانەکەمان لەوەدابوو تەواو ببێت و ڕۆژیش چوارشەممە بوو..

پێم وت: برۆ بۆ ئاوایی نان بهێنە، چونکە ماوەی دوو سەعات ڕێ لەم لا و لەو لاماندا کەسی لێ نییە نانی لێ بکڕین.

وتی: دەمەوێ ئەم شەوی جومعە پیرۆزەی داهاتوو لەسەر ئەم چیایە لەگەڵ تۆدا بمێنمەوە، تاکو لە پاڕانەوە و نزاکانتدا هاوبەش و هاوڕازت بم.

وتم: کەواتە باشە، پشت بە خوا بمێنەرەوە.

پاشان پێکەوە بۆ سەر لووتکەی چیاکە سەرکەوتین، هەرچەندەش هیچ داخوازی و پێویستییەك نەبوو بۆ سەرکەوتنمان. لەگەڵ خۆشماندا هەندێك ئاومان لەگەڵ کەمێك شەکر و چادا برد.

پێم وت: برام! چایەکمان بۆ لێبنێ.

ئەویش دەستی بە لێنانی چا کرد و، منیش لە ژێر درەختێکی قەتراندا دانیشتم و بە تێڕامانەوە سەیری شیوێکی قووڵم دەکرد و بە خەمەوە بیرم دەکردەوە و، لەبەرخۆمەوە بە خۆمم دەوت: لەتە نانێکی کەڕواویی کۆن نەبێ هیچی ترمان لە لا نییە و، لەوانەشە هەر تەنها بەشی ئەم ئێوارەیەی هەردووکمان بکات. ئەی ئایا بۆ دوو ڕۆژەکەی تر چی بکەم؟ چی بەم پیاوە دڵپاك و دەروون خاوێنە بڵێم؟!

لەم کاتەدا کە من نوقمی ئەم ئەندێشەیە ببووم، وەك بڵێی سەرم بۆلای درەختەکە وەربچەرخێنرێت ئاوا هەستم ■ کرد. منیش کە ئاوڕم بۆ لای درەختەکە دایەوە، کولێرەیەکی گەورەم لە ناو لق و پەلەکانی درەختە قەترانەکەدا بینی کە بۆ ئێمەی دەڕوانی! یەکسەر وتم:

سولەیمان! مژدە بێ، وا خوای گەورە ڕۆزی‌یەکی پێ بەخشیین!

پاشان نانەکەمان لەسەر درەختەکە داگرت و بە جوانی پشکنیمان تاکو بزانین ئایا شوێنەواری ئاژەڵ و باڵندەی لەسەر هەیە؟ کە سەرنجمان دا هیچ شوێنەوارێکی ئاژەڵمان پێوە نەبینی. سەرەڕای ئەوەش کە ماوەی سێ ڕۆژ دەبوو هیچ کەسێك بەو چیایەدا سەرنەکەوتبوو. ئیتر ئەو کولێرەیە بەشی دوو ڕۆژی کردین. ئنجا هەر کە نانەکەمان لەوەدا بوو تەواو ببێت، ئەو مرۆڤە ڕاستگۆیە کە ناوی "سولەیمان"ە و[1] هاوڕێ‌یەکی ڕاستی ماوەی چوار ساڵم بوو، سەرکەوتە سەر چیاکە بۆ لامان و، نانی لەگەڵ خۆیدا بۆ هێناین.

*چوارەمیان*: ئەم چاکەتەی بەرم حەوت ساڵ لەمەوپێش بە کۆنی کڕیومە! ئنجا چوار لیرە و نیویش بەشی خەرجی و مەسرەفی پۆشاك و پێڵاو و گۆرەویی پێنج ساڵی ڕابوردووی کردم!

بەم جۆرە، بەرەکەت و.. دەست پێوەگرتن و.. میهرەبانیی خواوەند.. سەروزیادم بوون.

گەلێ نموونەی تری وەك ئەمانە هەن، چونکە بەرەکەتی خوایی لایەنی زۆری هەیە. خەڵکی ئەم گوندە لە گەلێ نموونەی بەرەکەت ئاگادارن.

بەڵام وریا بن! وا گومان نەبەن کە من ئەم نموونانە بۆ شانازی کردن دەهێنم. نەخێر.. من ناچار کرام باسیان بکەم. هەروەها ئەوەشتان بە دڵدا نەیەت کە ئەمانە چەند نموونەیەك بن بەڵگەی صەلاحەت و پیاوچاکیی من بن. نەخێر، ئەو بەرەکەتانە چاکەکاریی خوای گەورەن بەرامبەر میوانە دڵسۆزەکانم.. یاخود ڕێزلێنانێکی خوایین بۆ خزمەتگوزارانی قورئان.. یان

---

(١) ئەمەیان سولەیمانێکی ترە و بە "سولەیمان کاروانچی" بەناوبانگە و، لە پێشەنگی کاروانی خزمەتگوزارانی ئیمان و نموونەی بەرجەستەی ڕاستی و وەفا و ئیخلاس بووە. ساڵی ١٩٦٥ز کۆچی دوایی کردووە. خوا لێی خۆش ببێت. (وەرگێڕ)

چەند سوود و دەستکەوتێکی پیرۆزی دەست پێوە گرتنن.. یان ڕۆزیی ئەو چوار پشیلەیەن کە لێرەدا لەگەڵمدان و لێم جیا نابنەوە و هەمیشە لە مرەمرەکانیاندا "یارحیم.. یارحیم.. یارحیم" دەکەن. کەواتە ڕۆزیی ئەوانە لە شێوەی بەرەکەتدا بۆیان دێت و، منیش لە لایەنی خۆمەوە سوودی لێ وەردەگرم.

بەڵێ، ئەگەر گوێ لە مرەمرى خەمناکی پشیلەکان ڕابگریت بە جوانی هەست دەکەیت کە زیکری: "یارحیم.. یارحیم.. یارحیم" دەکەن!

بە بۆنەی باسی پشیلەوە، مریشکیشم هاتەوە یاد..

مریشکێکم هەبوو، جار جار نەبێ، دەنا لەم زستانەدا هەرچی ڕۆژە هێلکەیەکی لە گەنجینەی میهرەبانیی خوای گەورەوە بۆ دەهێنام! تەنانەت ڕۆژێکیان دوو هێلکەی دانا! منیش گەلێ سەرم سووڕما و لە هاوڕێ خۆشەویستەکانم پرسی: ئایا لە زستاندا شتی وا ڕوو دەدات؟ وتیان: لەوانەیە ئەمە چاکەیەکی خوایی بێت.

هەر ئەم مریشکە، هاوین جووجەڵەیەکی هەبوو، ئەم جووجەڵەیە سەرەتای مانگی ڕەمەزان دەستی بە هێلکە دانان کرد و تا چل ڕۆژیش لەسەری بەردەوام بوو. ئیتر چ من و چ ئەو برایانەم خزمەتیان دەکردم، گومانمان لەوەدا نەما کە هێلکە دانانی ئەم جووجەڵە بچووکە لەم زستان و مانگی ڕەمەزانەدا جگە لە ڕێزلێنانێکی خوایی هیچی تر نییە. پاشان هەر ئەوەندەی دایکەکەی لە هێلکە چووەوە، ئەم جووجکەیە دەستی بە هێلکە دانان کردەوە و، سوپاس بۆ خوا، هێلکەی لێ نەبڕیم!

## سەعیدی نوورسی کێیە؟

❁ گەورەترین کەسایەتیی کوردی ئەم سەردەمە و، مەزنترین زانایە کە لە دوای (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) لەناو نەتەوەی کورددا هاتووەتە دنیاوە.

❁ لە گوندی (نوورس)ی سەر بە پارێزگای (بەدلیس)ی کوردستانی ژێر دەستەلاّتی عوسمانی لە دایك بووە و، لە نێوان ساڵەکانی (١٨٧٦-١٩٦٠ز)دا ژیاوە.

❁ تەنها کەسایەتیی ئەو ڕۆژگارە بووە کە هەموو زەبر و زەنگێکی ڕژێمی مستەفا کەمال و، دام و دەزگا چەوسێنەرەکانی و، سی و پێنج ساڵی بەندی و زیندانی تاکە کەسی و نەفی و دەست بەسەری و، دەیان دادگای تۆقێنەر نەیانتوانیوە چۆکی پێ دابدەن و لە خەباتی ڕەوای خۆی کۆڵی پێ بدەن. تەنانەت ئەو توانیویەتی سەرکەوتنیشیان بە سەردا بە دەست بهێنێت.

❁ زیاتر لە سەد و سی کتێب و پەیامی پێشکەشی هەموو گەلان و نەتەوەکانی سەر ڕووی زەوی کردووە و، بە زۆربەی زمانە زیندووەکانی جیهان - کە یەکێکیان زمانی کوردییە - بلاّو بوونەتەوە.

❁ تا ئێستا زیاتر لە پازدە کۆنگرەی جیهانی و، دەیان سیمینار و کۆڕی زانستی و پێشبڕکێی ڕۆشنبیریی لە ئاستی جیهاندا بۆ گیراوە و، دەیان کتێب و سەدان لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسراوە و، چەندین بەڵگەنامەی زانکۆییشی لە خوێندنی بالاّدا لەسەر وەرگیراوە.

# پێڕستی بابەتەکان

**بابەت** | **لاپەڕە**

* * *



ئەگەر دەتەوێت بزانیت:

- پێوەری "شوکرانە" و، نیشانەی "ناشکوری" چییە؟
- "دەستپێوەگرتن" چەندە پیت و بەرەکەتی لەخۆ گرتووە، بە پێچەوانەی "هەڵەخەرجی" کە هەر تەنها زیانی لێدەکەوێتەوە؟
- "قەناعەت" گەنجینەیەکی چەندە نەبڕاوەیە و، "هەڵپە"ش چۆن دەبێتە هۆی بێ بەشی؟
- "شارستانێتیی سەردەم" چۆن مرۆڤایەتیی گرفتاری هەژاری کردووە؟
- "فەلسەفەی ماددی" جگە لە چاویلکەیەکی ڕەش چیی تر نییە. بە پێچەوانەی "ئیمان" کە چاوێکی تیژی ڕووناکە و هەموو شتێك بە "جوان" دەبینێت!

ئەگەر پێت خۆشە وەڵامی ئەم پرسیارانە و هاوشێوەیان بزانیت، فەرموو بە شێنەیی ئەم کتێبە بخوێنەرەوە.




---

نرخی (٢٠٠٠) دینارە